

# دەرمانزانی

بەشی یەکەم


ئامادەکردن

ئاشنا عەلی

ڕێبین مەحمود

سەرکەوت حەسەن


Design | Muslim B Salim

2020 - 1442

# سیستەمی یەکەم ؛ Gastrointestinal System ( GIT )

## گرووپی یەکەم :-( Antacids )ـەکان

**Antacids** :- گرووپێکی دەرمان و پێکهاتەی تفتن ( تێکەڵەی چەند ماددەیەکن وەکو لە خوارەوە ئاماژەی پێکراوە) هەڵدەستن بە هاوکێش کردنەوەی ترشێتی لەکاتی زۆربوونی ترشێتی گەدەدا ، خۆیان تفتی لاوازن لەگەڵ ترشی گەدەدا کارلێک دەکەن و ئاو و خوێ پێکدێنن ، بەمەش ترشێتی گەدە کەم دەکەنەوە. ( ترش + تفت = ئاو + خوێ)

- هەر دەرمانێکی ئەم گرووپە لە تێکەڵەی دوو یان سێ یان زیاتری ئەم ماددانەی خوارەوە پێکدێت هەندێک جار ماددەی تریشی تێکەڵ دەکرێت وەک لە خوارەوە ئاماژەی پێکراوە ....

ماددەکان:-

1. Aluminum Hydroxide
2. Magnesium Hydroxide
3. Magnesium Carbonate
4. Calcium Carbonate
5. Sodium Bicarbonate



- ئەنتاسیدەکان بۆچی بەکاردێن:-

1) بۆ چارەسەرکردنی دڵەکزە. ( Heart Burn )
2) بۆ چارەسەری نیشانەکانی هەرسگرانی. ( Dyspepsia )
3) بۆ کەمکردنەوەی ئازاری برینی گەدە و دوانزەگرێ. ( Peptic Ulcer )
4) بۆ چارەسەری گەڕانەوە ترشێتی گەدە بۆ سورێنچک. Gastro Esophageal Reflux Disease (GERD)



- دەرمانەکانی ئەم گرووپە تەنها لەکاتی پێویستدا بەکاردێت واتە لە کاتی زۆربوونی ترشێتی گەدەدا بەکاردێت ، پێویست ناکات بەردەوام و بە ڕێکی بەکاربهێنرێت ، وەکو چۆن هەندێک دەرمان دوو وەختە یان سێ وەختە ( 3*1 یان 2*1 ) بەکاردێت ، دەرمانەکانی ئەم گرووپە بەو شێوەیە نییە.

باشتر وایە یەک سەعات دوای نان خواردن بخورێن ، چونکە عادەتەن ترشێتی گەدە 45 دەقە دوای نانخواردن دروست دەبێت بۆ ئەوەی ترشێتیەکە هاوسەنگ بکات باشتر وایە ئەو کاتە بخورێن.

- بەشێوەیەکی گشتی دەرمانەکانی ئەم گرووپە زۆر بە خێرای کاردەکەن و ترشێتی گەدە هاوسەنگ دەکەن بەڵام دوای ماوەیەکی کەم کاتەکەیان تەواو دەبێت واتە (Short Duration of Action) .

بەشێوەیەک ئەگەر بە گەدەی بەتاڵ بخورێن ئەوا 30 خولەک کاردەکەن ،بەڵام ئەگەر بەگەدەی پڕ بخورێن دوای نان نزیکی 2 بۆ 3 کاتژمێر کاردەکەن.

- دەرمانەکانی ئەم گروپە زیاتر بە شێوەی liquid ( گیراوە ) & Chewable Tablet ( حەبی کرماندن) پاودەر & قەترە ( Drop ) هەیە بۆ منداڵ . باشتر وایە بۆ خوار 6 ساڵ بەکار نەیەت.

- بەشێوەی liquid ( گیراوە ) باشترە کاردەکات وەک لە حەبی کرماندن ( ئەگەر هەمان پێکهاتەیان هەبێت) چونکە ڕووبەرێکی زیاتر لە ترشێتی هاوسەنگ دەکەن و خێراتریش کار دەکەن.

- ئەگەر کەسێک حەبەکەی بەکارهێنا دەیکرمێنێت و دوای کرماندنەکە باشتر وایە پەرداخێک ئاوی بەسەردا بکات.
- ئەو کەسەی کە ئەم گروپە دەرمانە بەکاردێنێت دەتوانێت بۆ دەرەوە و سەر کارەکانیان حەبی کرماندن لە گیرفانیاندا بێت و لە کاتی پێویستدا بەکاری بێنن ، ئەگەر لە ماڵەوەش بوون دەتوانن گیراوە ( شروبەکەی ) بەکاربێنن.

- بۆ حاڵەتی ( Dyspepsia & Heartburn ) : Over The Counter Drugs ( OTC ) واتە دەتوانرێت بەبێ ڕاچێتەی دکتۆر بدرێن ، بەڵام بۆ GERD & Ulcer دەبێت بە ڕاچێتەی دکتۆر بدرێن.

زیانی لاوەکییەکان :-

( Al+3 ) کەسەکە تووشی قەبزی دەکات

( Mg+2 ) کەسەکە توشی سکچوون ئەکات

زۆرکات شەریکاتی دەرمان ئەم دوو ماددەیە پێکەوە تێکەڵ دەکات لەیەک دەرماندا بەشێوەی ( Combination ) بۆ کەمکردنەوەی کاریگەری سکچوون و قەبزییەکە بەمەش جوڵەی ڕیخۆڵەکان ئاسایی دەبێت و توشی ئەو زیانە لاوەکییانە نابێت کەسەکە .

- بەهۆی تفتێتیەکەیانەوە دەرمانەکانی ئەگروپە چالاکی ئەنزیمی ( pepsin ) کەم دەکەنەوە ( pepsinogen ) لە پلەی ترشێتی کەمتر لە PH = 5 دەگۆڕێت بۆ pepsin . (pepsin ⟶ pepsinogen)

ئەنزیمی pepsin هەڵدەستێت بە شیکردنەوەی پڕۆتین بۆ گەردی بچوکی ئەمینۆ ئەسید لە گەدەدا بۆ ئەوەی بە ئاسانی لە لایەن ڕیخۆڵەکانەوە هەڵبمژرێن دەرمانەکانی ئەم گروپە ڕێگری دەکەن لە ڕوودانی ئەوە ، بەمەش هەڵمژینی پڕۆتینەکان لەلایەن ڕیخۆڵەکانەوە قورستر دەبێت.

- لەگەڵ چ دەرمانێکی تردا کارلێک دەکەن ( Interaction ) :-

لەگەڵ زۆرێک لە دەرمانەکانی تردا کارلێک دەکەن بۆیە باشتر وایە 1 بۆ 2 کاتژمێر بەینیان هەبێت لە کاتی وەرگرتنی ئەم دەرمانانەدا ئەمە هەندێک لەو دەرمانانەن :-

( Iron , Digoxin , NSAIDs , Quinolone , Cephalosporin , Bisacodyl , Aspirin , Tetracycline )

- لە چ حاڵەتێکدا نابێت بەکاربهێنرێت ( Contraindication ) :-
ئەوانەی کە Sodium bicarbonate یان تێدایە ، نابێت بۆ ئەو کەسانە بەکاربهێنرێت کە Chronic Heart Failure (CHF) ، Hypertension (HTN ) هەیە.

- ئەو نەخۆشانەی کە ئەمانەیان لەگەڵە ، دەبێت بە ڕەزامەندی دکتۆری پسپۆڕ پێیان بدرێت :-



- Kidney disease
- Sever diarrhea
- Sever Constipation

- نابێت بەشێوەیەکی بەردەوام و بۆ ماوەیەکی درێژ بەکاربهێنرێت چونکە ئەگەر ڕوودانی ئەم زیانە لاوەکیانەشی هەیە ئەگەر بۆماوەی زیاتر لە 6 هەفتە بەکاربهێنرێت :-
  - پوکانەوەی ئێسکەکان (Osteoporosis)
  - کەمخوێنی (Anemia)
  - بەدخۆراکی (Malnutrition)

وە چەندین کێشەی تر بۆیە باشتر وایە ئەگەر زیاتر لە چەند هەفتەیەک بەکاری بێنیت بە ڕەزامەندی دکتۆری پسپۆڕ بێت باشترە ، بەڵام ئەگەر تەنها بۆ کاتی پێویست و بەدۆزی پێویست بەکاربهێنرێت چارەسەرێکی زۆر باشە چونکە وەکو پێشتریش ئاماژەمان پێکرد زۆر بەخێرای کاردەکەن و ترشێتیەکە هاوسەنگ دەکەن.

- هەندێک شەریکە جگە لەو 5 ماددەی سەرەوە کە ووتمان دوو یان سێ دانەیان تێکەڵ دەکات ماددەی تریشی تێکەڵ دەکەن وەک :-
  - هەندێک جار ( Simethicon ) یان تێکەڵ دەکات بۆ ئەو کاسانەی کە لەگەڵ زۆری ترشێتی گەدەدا غازاتیشیان هەیە ئەم دەرمانە غازاتەکەیان کەم دەکاتەوە.
  - Alginate کە وەکو جێڵ یان کەف وایە ڕووپۆشی گەدە و سورێنچک دەپاێزێت لە برینداربوون ناهێڵێت ئەو ترشێتییە زیان بەو ڕووپۆشە بگەیەنێت.
  - Oxethazaine ئەمەش بۆ کەمکردنەوە ئازار برینی گەدە و دوانزە گرێ بەکاردێت .
  - Famotidine ئەمەش سەر بە گروپی ( Histamine H2 Receptor Blocker ) کە دواتر دەیخوێنین هەر لەم سیستمەدا إن شاء اللّه

لەگەڵ کالیسیۆم کاربۆنەیت & مەگنیسیۆم هایدرۆکساید بەتێکەڵی هەمانە بەشێوەی حەبی کرماندن ، بەم شێوەیە باشتر کاردەکەن بۆ کەمکردنەوەی ترشێتی گەدە ، بۆ نمونە وەکو ( Gastro protect ) کە پێکهاتەکەی بەو شێوەیە.

- ئەمەش ناوی بازرگانی چەند دەرمانێکی ئەم گروپەیە کە لە بازاڕدا باون :-

Rennie



Gaviscon

Acilox

Maalox

Maalox plus

Samarin

ئیتر شەریکاتمان زۆرە کە دەرمانەکانی ئەم گروپە دروست دەکەن گرنگترین شت ئەوە کە تۆ سەیری پێکهاتەکەی دەکەیت لەو پێکهاتانەی سەرەوە پێکهاتووە کە باسکراوە.

- دەرمانەکان ناوی بازرگانی و ناوی زانستیان هەیە هەر کۆمپانیایەک دەرمانێک دەخاتە بازاڕە ناوێکی تایبەتی بۆ دادەنێت بەڵام هەموویان هەمان ناوی زانستیان هەیە بۆیە ئەگەر ئێوە ناوی زانستی دەرمان بزانن هەر دەرمانێک بێتە بەردەستان سەیری ناوە زانستییەکەی بکەیت دەیناسیتەوە.


















## گروپی دووەم :- Proton Pump Inhibitors ( PPI )

- کۆمەڵێک دەرمانن هەڵدەستن بە بلۆککردنی چالاکی ئەنزیمی ( H+ K+ ATPase) کە لە ( Parietal Cells ) لەدیواری گەدەدا هەیە و بەشێوەی (Irreversible ) بلۆکیان دەکەن و لێیان نابنەوە ، کە دەبێتە هۆی دروستبوونی ترشی گەدە.
- چالاکی ئەم ئەنزیمە وا دەکات کە ( H+ ) بکرێتە ناو گەدە (K+ ) وەربگرێت ، ( Cl- ) هەیە لەناو گەدەدا کاتێک H لەگەڵ Cl یەکدەگرن HCL ( ترشی هایدرۆکلۆریک ) دروست دەکەن H+ + Cl- -------> HCL
بۆ ئەوەی ڕێگرە لەو کرداره بگرین و نەهێڵین H+ بکرێتە ناو گەدەوە و لەگەڵ Cl یەک نەگرێت دەبێت چالاکی ئەو ئەنزیمە بوەستێنین ئەو کارەش بەم کۆمەڵە دەرمانە دەکرێت کە ناویان( PPI ) یەکانە .

- دەرمانەکانی ئەم گروپە بۆ چ کەسێک بەکاردێت:-
  - زیادبوونی ترشێتی گەدە.
  - کەسێک برینی گەدە یان دوانزەگرێی هەبێت ، ئەگەر ترشێتی گەدە کەم نەکەینەوە ئەوا زیاتر برینداری دەکات کە زۆری ترشی هایدرۆکلۆریک خۆی هۆکارە بۆ دروستبوونی برینی گەدە و دوانزەگرێ.
  - بۆ چارەسەری گەڕانەوەی ترشێتی بۆ سورێنچک Gastro Esophageal Reflux Disease (GERD )
  - ئەوانەی کە بەکتریانی گەدەیان هەیە ( H Pylori ) دەبێت بۆ ماوەی 4 بۆ 6 هەفتە بەردەوام بن لە بەکارهێنانی دەرمانێکی ئەم گروپە بەڵام لەگەڵ دوو دەرمانی تردا پێکەوە وەردەگیرێن ئەوانیش لە کاتی خۆیدا بەجوانی باسی لێوە دەکەین ان شاء الله.



- دەرمانەکانی ئەم گروپە ئەمانەن:-

| | | |
|---|---|---|
| Esomeprazole | Pantoprazole | Omeprazole |
| Dexlansoprazole | Lansoprazole | Rabeprazole |

- شێوازی بەکارهێنانیان

بەزۆری هەموو دەرمانەکان بە دوو دۆز هەیمانە بۆ نمونە :-

( Omeprazole & Pantoprazole & Esomeprazole ) 20mg & 40mg

( Lansoprazole ) 15mg & 30mg

( Rabeprazole ) 10mg & 20mg

( Dexlansoprazole ) 30mg & 60mg

واتە هەموویان بە دۆزێکی کەمتر و دۆزێکی زیاتر هەیمانە ، بەگشتی ئەوانەی دۆسەکەی کەمترە

1*2( 12 کاتژمێر جارێک) بخورێن ، بەیانی و ئێوارە 30بۆ 60 خولەک پێش نان دەبێت بخورێت ، بەڵام ئەوانەی دۆسەکانیان زیاترە 1*1 ( 24 کاتژمێر جارێک) بخورێن 30 بۆ 60 خولەک پێش نان دەبێت بخورێت.

بۆ نمونە Pantoprazole 20 mg دەبێت 2*1 بخورێت ، بەڵام Pantoprazole 40 mg دەبێت 1*1 بخورێت.

هەندێک جار دکتۆر 40 mgیش 2*1 دەنوسێت بۆ ماوەیەکی دیاریکراو دواتر دەیکاتەوە بە 1*1 بەڵام بەگشتی بەو شێوەیەی سەرەوەوە بەکارێت کە باسم کردووە.

- هەندێک جاردکتۆر لەگەڵ گروپی NSAID کاندا دەینوسێت

(NSAID) گروپێکی دەرمانن کە دواتر دەیان خوێنین زیانیان هەیە بۆ گەدە و ئەگەر کەسێک خۆی کێشەی گەدەی هەبێت کێشەی بۆ دروست دەکات ( لەگەڵ خوێندنی گروپی NSAIDs باسی دەکەین بۆچی زیانیان هەیە بۆ گەدە)
بۆیە دکتۆر بۆ ئەوەی گەدەی کەسەکە سەلامەت بێت دەرمانێکی ئەم گروپەشی لەگەڵ دەنوسێت.

بەشێوەیەکی گشتی (half life ) کەمە نزیکی 60 بۆ 90خولەکە.

ڕەنگە بپرسیت بۆ 1*1 یان 2*1 دەدرێت لەکاتێکدا half life یان کەمە ، وەڵامەکەی ئەوەی وەک ئەوەی لەسەرەتاوە ئاماژەم پێکردووە بەشێوەی ( Irreversible ) ئەو پەمپە بلۆک دەکات و لێی نابێتەوە دەبێت سەرلەونوێ پەمپی نوێ دروست بێتەوە بۆئەوەی هەمان ئیش بکاتەوە ئەمەش کاتێکی زۆری دەوێت .

- زیانە لاوەکییەکانی ئەم گروپە چین ؟

دیارترین و باوترین کاریگەرییە لاوەکییەکانی ئەمانەن :-

- سەر ئێشە
- سکچوون یان قەبزی
- غازات و ئازاری ناوسک
- هێڵنج
- تا



ئەگەر بۆماوەیەکی درێژ بەکاربهێنرێت ڕەنگە ئەم زیانە لاوەکییانە ڕووبدات :-

- ئەگەری تووشبوون بە بەکتریای Clostridium difficile زیاد دەکات ، کە دەبێتە هۆی هەوکردنی ڕیخۆڵەکان و سکچوون .
- لە ئەنجامی کەمکردنەوەی ترشی گەدەدا بەمەش Pepsinogen ناگۆڕێت بۆ Pepsin وەکو لە وانەی پشووتریش ئاماژەمان پێکرد کە Pepsin هەڵدەستێت بە شیکردنەوەی پرۆتین بۆ گەردی بچوکتر بۆ ئەوەی بە ئاسانی لەلایەن ڕیخۆڵەکانەوە هەڵبمژرێن ، بەمەش هەڵمژینی پرۆتینەکان لەلایەن ڕیخۆڵەکانەوە قورستر دەبێت.
- ڕێژەی هەڵمژینی Vit B12 کەم دەکەنەوە لە ئەنجامدا بێهێزی و لاوازبوونی ئێسکەکان ڕوودەدات .

بەڵام مەرج نییە ئەم زیانە لاوەکییانە لە هەموو نەخۆشێکدا دەربکەوێت.

- کارلێکردن لەگەڵ دەرمانەکانی تردا(Drug Interaction) :-

ئەو نەخۆشانەی کە Clopidogril ( Plavix) & Warfarin بەکاردێنن ،ئەگەر کێشەی گەدەیان هەبێت ، نابێت Omeprazole و Esomeprazole بەکاربێنن ، باشتر وایە Pantoprazole بەکاربێنن.

ئەو نەخۆشانەی کە Digoxin & Methotrexate & Harvoni بەکاردێنن ، نابێت بەهیچ شێوەیەک دەرمانەکانی ئەم گروپە بەکاربێنن . لەگەڵ چەند دەرمانێکی تریشدا کارلێک دەکەن دواتر دەتوان خۆتان سێرچی بۆبکەن ئەگەر وویستان.

**بۆ ئافرەتی دووگیان :-**

**( Pantoprazole & Lansoprazole & Esomeprazole & Rabeprazole & Dexlansoprazle ) = Catagory ( B )**

**تەنها ( Omeprazole ) = Catagory C**

**وەکو لەسەرەتاوە باسم کرد ئەم گروپە زۆر بەکاردەهێنرێت و زۆر باشە بۆ کەم کردنەوەی ترشێتی گەدە.**

**.............................................................**

## زانیاری //

**PREGNANCY CATEGORY DEFINITIONS (پۆلێنی دەرمانی لە کاتی سکپڕیدا)**

**گروپی : A بەشێوەیەکی گشتی دەرمانەکانی ئەم گروپە قبوڵکراون و سەلامەتن بۆ بەکارهێنان لەلایەن دایکی دووگیانەوە توێژینەوەکان هیچ بەڵگەیەکیان نییە لەسەر مەترسی ئەم دەرمانانە لەسەر کۆرپەلە.**

**گروپی : B لەوانەیە دەرمانەکانی ئەم گروپە قبوڵبکرێن ، توێژینەوەکان لەسەر ئاژەڵ تەنها چەند مەترسیەکی کەم پێشان دەدەن بەڵام لەسەر مرۆڤ تائێستا هیچ توێژینەوەیەک نییە.**

**گروپی :C دەرمانەکانی ئەم گروپە دەبێت بە ئاگاییەوە بەکار بێن ، توێژینەوەکان لەسەر ئاژەڵ مەترسییان ڕاگەیاندووە لەسەر کۆرپەلە ، بەڵام لەسەر مرۆڤ هیچ توێژینەوەیەک نییە . نابێت بەبێ ڕەزامەندی دکتۆری پسپۆڕ بەکاربهێنرێت .**

**گروپی : D بەکارهێنانی دەرمانەکانی ئەگروپە مەترسی کوشندەیان هەیە لەسەر کۆرپەلە ، بەڵگەی پۆزەتیف هەیە لە مرۆڤدا لەسەر مەترسی ئەم دەرمانانە لەسەر کۆرپەلە .**

**گروپی : X دەرمانەکانی ئەم گروپە نابێت بەهیچ شێوەیەک بەکاربێن لە کاتی دووگیانیدا.**
























- دەرمانەکانی ئەم گروپە زۆر کاریگەرن بۆ کەمکردنەوەی ترشێتی گەدە بەتایبەتی لە شەواندا و کاتی خەو ، ڕیسێپتەری H2 بلۆک دەکەن ، زۆر دەقیقن تەنها H2 بلۆک دەکەن ( H1 & H3 ) ی بلۆک ناکەن.
- دەرمانەکانی ئەم گروپە ڕیسێپتەری وەرگری هیستامین 2 بلۆک دەکەن لە( Paraietal Cells ) کان لە گەدەدا ، بەمەش ڕێگری دەکەن لە زیادبوونی ترشێتی گەدە.

- دەرمانەکانی ئەم گروپە بۆچی بەکاردێن :-
  - بۆ ئەو کەسانەی برینی گەدە و دوانزەگرێیان هەیە.
  - بۆ کەم کردنەوەی ترشەڵۆکی گەدە.
  - بۆ چارەسەری گەڕانەوەی ترشەڵۆکی گەدە بۆ سووڕێنچک Gastro Esophageal Reflux Disease ( GERD )
  - بۆ چارەسەری نیشانەکانی هەرس گرانی.
  - بۆ ئەو کەسانەی کە بە شێوەی ناوە ناوە و بەردەوام دڵەکزەیان هەیە.
  - بۆ منداڵ و تازە پێگەشتوان ئەوانەی کە ناوە ناوە یان بەردەوام دڵەکزەیان هەیە و پەیوەندی شێوازی ژیانیانەوە نییە ، چونکە قەلەقی و چۆنییەتی شێوازی ژیان کاریگەری ڕاستەوخۆی هەیە لەسەر زیادبوونی ترشێتی گەدە .

- دەرمانەکانی ئەم گروپە ئەمانەن :-

Cimetidine ( Tagamet )

Ranitidine ( Zantac )

Famotidine

Nizatidine

Loxatidine

Roxatidine

- دەرمانەکانی ئەم گروپە چۆن بەکاردێن :-

بەگشتی یەک بۆ دوو وەختە وەردەگیرێن ، ئەگەر یەک وەختەبوون ( 1*1 ) ئەوا باشتر وایە شەوانە پێش خەوتن بخورێن ، ئەگەر دوو وەختە بوون ( 1*2 ) ئەوا بەیانی و ئێوارە لەگەڵ نانداباخورێن ، بەپێی دۆزەکەی و کێشەی کەسەکە دەگۆڕێت دۆزی کەمترمان هەیە سێ وەختە تا چوار وەختەش دەخورێن بەڵام وەکو ووتم بەگشتی یەک بۆ دوو وەختەیە ، ئەویش بەپێی حاڵەتی کەسەکە کە چی هەیە و دۆزی دەرمانەکە دەگۆڕێت ، بەڵام نابێت بەردەوام بەکاری بهێنرێت بەبێ ڕەزامەندی دکتۆر .

- بە گشتی دەرمانەکانی ئەم گروپە Over The Counter Drugs( OTC )

واتە دەتوانن بەبێ ڕاچێتەی دکتۆر بدرێن ، بەڵام ( Nizatidine ) تەنها بە ڕاچێتەی دکتۆر دەدرێت .

بەڵام نابێت بەشێوەیەکی هەمیشەی و بۆ ماوەیەکی درێژ بەبێ ڕەزامەندی دکتۆر وەربگیرێت .

ئاگاداربە // ئەگەر کەسێک دەرمانەکانی ئەم گروپەی بەکارهێنا و ئەم نیشانانەی تیا دەرکەوت :- ئەگەر کەسەکە رشانەوەی خوێناوی هەبوو یان پیسا ییەکەی ڕەش بوو دەبێت بەکارهێنانی دەرمانەکە بوەستێنێت و سەردانی دکتۆر بکات.

- Famotidine بەزۆری بەشێوەی حەبی کرماندن (Chewable Tablet) هەیە
بە تێکەڵی لەگەڵ کالیسیۆم کاربۆنەیت &مەگنیسیۆم هایدرۆکساید کە لە ئەنتاسیدەکانیشدا باسمان کرد ، بەهۆی تێکەڵ کردنیانە و هەم باشتر کار دەکەن و بۆماوەیەکی درێژتریش بەردەوام دەبن لە کارکردن.
بۆ نمونە (Gastro protect ) کە پێکهاتەکەی بەم شێوەیە.
بەتێکەڵیش لەگەڵ ( Ibuprofen ) هەیمانە کە ئەمەیان سەربە NSAIDsـەکانە کە بۆ ئازار و ئلتیهابات (Inflammation) بەکاردێت بەڵام بۆ ئەو کەسانەی کێشەی گەدەیان هەیە زیانی زیاتر دەگەیەنێت بە گەدەیان ( لەکاتی خۆیدا ڕوونی دەکەینەوە کە چۆن و بۆچی ئەو زیانەی هەیە) فامۆتیدینی لەگەڵ تێکەڵکراوە بۆ ئەوەی کاریگەری لەسەر گەدە کەمتر بێت .

لەگەڵ چ دەرمانێکی تردا کارلێک دەکەن(Drug interaction ):-

Cimetidine لەگەڵ چەند دەرمانێکی تردا کارلێک دەکات چونکە چالاکی ئەنزیمەکانی جگەر (CYP 450 isoenzymes) ڕادەگرێت ، بۆیە نابێت لەگەڵ ئەم دەرمانانەدا پێکەوە بخورێن :-

| | |
|---|---|
| Warfarin | Thiophylline |
| Propranolol ( Inderal ) | Clopidogril ( Plavix ) |

لەگەڵ چەند دەرمانێکی ترشیدا کارلێک دەکات ئەگەر ویستتان دەتوانن سێرچی بۆ بکەن.

بەڵام Famotadine & Nizatadine ئەو کاریگەرییەیان نییە و کارلێک ناکات لەگەڵ ئەو دەرمانانەدا .

- زیانی لاوەکی :- زۆربەکەمی ئەمانە ڕوودەدات
  - سەرئێشە
  - گێژبوون
  - بێهێزی
  - ئازاری ناوسک
  - قەبزی یان سکچوون
  - Cimetidine ( Weak Ant androgenic ) ئیفێکتی هەیە

ئەگەر بۆماوەیەکی درێژ بەکاربهێنرێت ڕەنگە ببێتە هۆی ڕوودای ئەمانە لەپیاواندا :-

( Gaynicomastia ) گەورەبوونی مەمک لە پیاواندا و کەمبوونەوەی ڕێژەی سپرم.

Galactorrhoea ڕژانی شیر لە مەمکی ئافرەتان تەنانەت لەو ئافرەتانەشدا کە هەر منداڵیان نەبووە ئەمەش بەهۆی بەرزبونەوەی ڕێژەی پرۆلاکتین کە بەرپرسە لە بەرهەمهێنانی شیر.

بەڵام ئەمە مەرج نییە لە هەموو کەسێکدا ڕووبدات زۆر بە کەمی ڕوودەدەن.

بەگشتی دەرمانەکانی ئەم گروپە زیانی لاوەکییان زۆر کەمە.

**ئاگاداربە //** ئەوانەی کە کێشەی گورچیلەکانیان و جگەریان هەیە بەتایبەتی ئەوانەی تەمەنیان لەسەروی 50 ساڵەوەیە باشتر وایە بەبێ ڕەزامەندی دکتۆر دەرمانەکانی ئەم گروپە بەکارنەهێنن.

Famotidine سەلامەتە بۆ ئەو کەسانەی کێشەی جگەریان هەیە .

- بۆ ئافرەتی دووگیان :-

Cimetidine & Famotidine = ( B )

Nizatidine & Roxatidine = ( C )

.............................................................................

**ئاگاداربە //** بە فەرمی دەزگای خۆراک و دەرمان (FDA) بڕیاری کشاندنەوەی دەرمانی ( Ranitidine ) زانتاک ی ڕاگەیاند لە هەموو دەرمانخانە و نەخۆشخانەکان ، داوای لە هاوڵاتیان کرد ئیتر بەکاری نەهێنن چونکە دەرکەوتووە ماددەی

N-nitrosodimethylamine تێدایە ، ماددەی شێرپەنجەیی (NDMA) ماددەیەکی مەترسیدارە و ڕەنگە ببێتەهۆی شێرپەنجە ئەو ماددەیە لەنێو ئاو، خۆراک و بەرهە دەرمانسازییەکاندا بە بڕێکی دیاریکراو هەیە بەڵام کاتێک لە بڕی پەسەندکراو زیاتر دەبێت مەترسیی لەسەر تەندروستیی بەکارهێنەر دروستدەکات.

**تێبینی /** ناوی دەرمانەکان ناوە زانستییەکەیانم نووسیوە بۆتان ئەوەشی لەناو کەوانەکاندایە ناوی هەمان دەرمانە بەڵام ناوە بازرگانیەکەیەتی لەبازاڕدا زیاتر بەو ناوانەوە باون.









## گروپی چوارەم :- Mucosal Protective Agents

- دەرمانەکانی ئەم گروپە ڕووپۆشی ڕووی ناوەوەی گەدە دەپارێزن.

دەرمانەکانی ئەم گروپە :-

-Sucralfate (Antepsin)

-Bismuth Compounds

-Misoprostol (Cytotic)

پێش ئەوەی دەست بکەین بە باسکردنی هەر یەک لەمانە ، دەبێت بزانین ئەو هۆکارانە چین کە ڕووپۆشی ڕووی ناوەوەی گەدە دەپارێزن وە ئەو هۆکارانە چین کە زیان بەو ڕووپۆشە دەگەیەنن.

- هۆکارە پارێزەرەکان ئەمانەن :-
  - پرۆستاگلاندینەکان (Prostaglandins)
  - لینجە ماددە (Mucus)
  - بیکاربۆنەیت (Bicarbonate)
  - هاتنی خوێن بۆ ئەو ڕووپۆشەی ڕووپۆشی ناوەی گەدەی کردووە (Mucosal Blood Flow)



ئەگەر خوێنی هاتوو بۆ ڕووپۆشەکە بڕێکی پێویست بێت ئەوا کاریگەری زۆر باشی دەبێت بۆ پاراستنی ڕووپۆشەکە لە ڕێگەی ئەو خوێنەی کە بۆی دێت ئۆکسجین و بیکاربۆنەیت (وەکو باسمان،کردووە یەکێکە لە هۆکارە پارێزەرەکان) وەردەگرێت ، وە لەڕێگەی ئەو خوێنەوە ئایۆنی هایدرۆجین [ (H+) وەکو باسمان کرد کە لەگەڵ (Cl-) یەکدەگرێت و HCL بەرهەمدێنێت ] و ماددە ژەهراوییەکان هەڵدەمژرێت و بەمەش سوودی باشی دەبێت بۆ ڕووپۆشەکە.

- هۆکارە زیان بەخشەکان ئەمانەن :-
  - ترشەڵۆک (Acid)
  - [ پێپسین ] (pepsin) کە لە وانەکانی پێشوودا باسمان کردووە کە چییە و چۆن دروست دەبێت.
  - (NSAIDs) ئەمەش گروپێک دەرمان لەکاتی خۆیدا باسی دەکەین
  - (Helicobacteria Pylori) بەکتریایی

..............................................................................................

Sucralfate ئەم دەرمانە بریتیە لە جووت شەکرێک کە گۆگرد لە پێکهاتەکەیدا هەیا بە شێوەی (Sulfate) ، پێکدێت

[Aluminium hydroxide + Sulfate Sugar (Sucrose)]

- وەکو بەربەستێک بەشێوەی (Gel) کاردەکات و ڕووپۆشەکە دەپارێزێت لە (ترشەڵۆکی گەدە ، پێپسین ، زەرداو)(Bile salt)

هەر وەها وەکو پۆلیمەرێک دەنوسێت بەو شانانەی کە تووشی برین بوون و دەیان پارێزن لە هۆکارە زیان بەخشەکان .

- بۆچی بەکاردێت :-
  - ( Gastric & Duodenal Ulcer ) کەسێک برینی گەدە و دوانزەگرێی هەبێت.
  - ( Gastritis ( Inflammation of the lining of the stomach ئەو کەسانەی ئلتیهابی گەدەیان هەیە.
  - ( GERD ( Gastro Esophageal Reflux گەڕانەوەی ترشەڵۆکی گەدە بۆ سورێنچک.
  - ( Prevention Stress Ulcer ) بۆ ڕێگری کردن لە تووشبونی گەدە بەهۆی قەلەقییەوە.
  
  (وەکو باسمان کردن قەلەقی کاریگەری زۆر خراپی هەیە لەسەر گەدە)

- ئەم دەرمانە بۆ چالاکبوونی پێویستی بە ناوەندێکی ترش هەیە بۆیە نابێت ئەو دەرمانانەی لەگەڵ بخورێن کە ترشێتی گەدە کەم دەکەنەوە چونکە ڕێگری لەکاری ئەم دەکەن و بەناچالاکی دەمێنێتەوە ، ( Antacid & PPI & H2RB ) ئەو سێ گروپەی پێشوو کە باسمان کرد نابێت بەکاریان بێنێت لەگەڵ ئەمدا دەبێت نێوانیان هەبێت بۆ ئەوەی کارلێک نەکەن پێکەوە .

- بەشێوەی حەبی ( 1 گرامی ) & گیراوەی شروبی 200mg/ml
  دەبێت بە گەدەی بەتاڵ خورێت ( یەک کاتژمێر پێش نان یان دوو کاتژمێر دوای نان ).
  چوار ژەمە دەخورێت ( 4*1 ) هەر شەش کاتژمێر جارێک دەبێت بۆ ماوەی 4 بۆ 8 هەفتە وەربگیرێت.
  بەڵام بۆ ڕێگریکرن لە تووشبونی ڕیخۆڵە لە برین (2*1) وەردەگرێت .
  لە ڕۆژێکدا نابێت لە 8 gram زیاتر وەربگیرێت ، بەگشتی ئەگەری تووشبوونی کەسەکە بە ژەهراوی بوون بەهۆی ئەم دەرمانەوە زۆر لاوازە.
  ئەگەر کەسێک حەبەکەی بۆ قوت نەدرا دەتوانێت بیکاتە ناو 15 بۆ 30 مڵ ئاوەوە دواتر بیخواتەوە .

Kaka Lea

- بەتێکەڵیش لەگەڵ ( Oxethazaine ) هەمانە بەشێوەی شروب کە لە گروپی یەکمدا باسمان کرد کە ئەمەیان وەکو سڕکەر وایە و ئازار کەم دەکاتەوە .
  لەگەڵ ( Domperidon + Simethicone ) هەمانە بە تێکەڵی بەشێوەی شروب کە ( Domperidon ) لە گروپەکانی داهاتوودا باسی لێوە دەکەین کە دژە ڕشانەوەیە بۆ ئەو کەسانەیە کە لەگەڵ ئەو کێشانەشدا ڕشاوەشیان هەیە ( Simethicone ) دژە غازاتە بۆ ئەو کەسانەی کە غازاتیشیان زۆرە لەگەڵیدا .

- لەگەڵ زۆرێک لە دەرمانەکانی تردا کارلێک دەکات بۆیە لانی کەم دەبێت 2 کاتژمێر نێوانیان هەبێت لەگەڵ بەکارهێنانی ئەم دەرمانەدا.

- زیانە لاوەکییەکانی ئەم دەرمانە :-
  ( قەبزی ، دڵ تێکچوون ، سەر ئێشە ، ئازاری پشت ، تێکچوونی خەو ، وشکبوونی دەم ، گێژبوون)
  باشتر وایە ئەوانەی کە ئەم دەرمانە وەردەگرن سەیارە لێنەخوڕن لەو کاتەدا .

- ئەوانەی ئەم کێشانەیان هەیە دەبێت بە ووریایەوە بەکارییێنن :-

( کێشەی گورچیلەکان ، شەکرە ، بەتەمەنەکان)

ئەوانەی کە شەکرەیان هەیە و ئەم دەرمانە وەردەگرن دەبێت ڕۆژانە فەحسی شەکرە بکەن.

- ئەو کەسانەی نابێت ئەم دەرمانە بەکاربێنن کێن :-
  - ئەوانەی هەستیاریان هەیە بەم دەرمانە.
  - ئەوانەی کێشەی گیرانی ڕیخۆڵەکانیان هەیە.
  - ئەوانەی کە کێشەی درەنگ بەتاڵ بوونەوەی گەدەیان هەیە.
  - منداڵی خوار تەمەن 15 ساڵ.
  - Category = B

.........................................................................

**Bismuth Compounds** بە سێ شێوە ئەم دەرمانەمان هەیە :-

**Bismuth Nitrate**

**Bismuth Subcritrate**

**Bismuth Subsalicylate**

- ئەم دەرمانە بەرگێک دروست دەکات بۆ پاراستنی برینەکە لەو هۆکارە زیان بەخشەکان وەک لەسەرەوە باسمانکردووە ڕێگری دەکات لە چالاکی پێپسین . هانی دەردانی لینجە ماددە و بیکاربۆنەیت دەدات ( ئەم دووانەیان لە هۆکارە پارێزەرەکان بوون).

- بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ کاریگەری هەیە لە دژی بەکتریایی (H . Pylori) بۆیە جاری وا هەیە لەگەڵ دەرمانەکانی تردا کە بۆ تێکشکاندنی بەکتریایی گەدە بەکاردێن ( گروپی داهاتوو باسی لێوە دەکەین کە چین ) دکتۆر ئەم دەرمانەش دەنووسێت .

- ئەم دەرمانە بۆ کێ بەکاردێت :-
  - تێکچوونی گەدە.
  - دڵەکزە.
  - سکچوون

  بۆ ئەو کەسانەی کە تووشی سکچوون بوون بەهۆی ئیلتیهابات(Infection) وە ، وەکو دژە سکچوون کاردەکات بۆ کەمکردنەوە سکچوونەکەیان ، بۆ ڕێگریکردن لە تووشبوون بە سکچوون بۆ ئەو کەسانەی کە لەکاتی سەفەردا تووشی سکچوون دەبن بەسوودە.

- ڕەنگە ببێتە هۆی ڕەشبوونی زمان و پیسایی .

دەبێت ئاگاداربن کە کەسێک ئەم دەرمانەی بەکارهێنا ڕەنگە پیساییەکەی ڕەش بێت ئەوە یەکێکە لە زیانە لاوەکییەکانی دەرمانەکە ، نابێت لەگەڵ خوێنبەربوونی بەشی سەرەوەی کۆئەندامی هەرس تێکەڵی کەیت و بە نەخۆشەکە بڵێی لە بەشی سەرەوەی کۆئەندای هەر ڕەنگە خوێنبەربوونت هەبێت ، چونکە ئەوانەشی کە خوێنبەربوونی بەشی سەرەوەی کۆئەندامی هەرسیان هەیە یەکێک لە نیشانەکان ئەوەیە کە پیساییەکەی ڕەش دەبێت.

- Category = C

---

Misoprostol ( Cytotic )

- ئەم دەرمانە هاوشێوەی پرۆستاگلاندینی ا (PGE1 Analogue)
کە ڕۆڵێکی گرنگی هەیە لە پاراستنی ڕووپۆشی ڕووی ناوەوەی گەدە.
ئەم دەرمانە دەنوسێت بە وەرگری پرۆستاگلاندینی E1 ( PGE1 Receptor ) بڕێکی زیاتر PGE1 دروست دەکات
وەک باسمان کردووە پرۆستاگلاندین لە هۆکارە پارێزەرەکانە.

- فرمانی پرۆستاگلاندین PGE1 لە گەدەدا :-
هانی دەردانی لینجە ماددە و بیکاربۆنات دەدات.
موولولەکانی خوێنی نزیک ئەو ناوەندە فراوان دەکات بەمەش بڕێکی زیاتر لە خوێن دێت بۆ ڕووپۆشەکە ( لەسەوە باسمانکرد ئەگەر بڕێکی گونجاو خوێنی بۆ بێت یەکێکە لە هۆکارە پارێزەکان)
کە هاوکاری دروستبوونی خانەکان دەدات و ڕێگری دەکات لە دروستوونی ترشەڵۆکی گەدە بە هەڵمژینی. ( H+ )



- ئەم دەرمانە بۆ کێ بەکاردێت :-
ئەو کەسانەی کە پێویستە یەکێک لە دەرمانەکانی گروپی (NSAIDs) بەکاربێنن و پێشتر برینی گەدەی هەبووە بۆ ئەوی ڕێگری بکرێت لە ڕوودانی ئەوە ئەوا دکتۆر ئەم دەرمانەی بۆ دەنوسێت کە لەگەڵی بەکاری بهێنێت.
بۆ بەتەمەنەکان بەتایبەتی ئەوانەی پێشتر برینی گەدەیان هەبووە ، پێویست دەکات یەکێک لەدەرمانەکانی (NSAIDs) بەکاربێنن ، بۆئەوەی ڕێگری بکرێت لە ڕوودانی دووبارە بریندار بوونەوەی گەدە دکتۆر لەگەڵیدا ئەم دەرمانەی بۆ دەنوسێت بۆ ئەوای بەکاری بهێنێت لەگەڵی.

- زیانەلاوەکییەکانی ئەم دەرمانە چین :-
  - سکچوون و گرژبوون و ئازاری ناوسک.
  - هێڵنج و ڕشانەوە.
  - سەرئێشە.
  - هانی گرژبوون و بچووک بونەوەی منداڵدان دەکات.
  - Category = X

بەهیچ شێوەیەک نابێت ئافرەتی دووگیان بەکاری بهێنێت ، چونکە دەبێتە هۆی گرژبوونی منداڵدان و لەبارچوونی منداڵەکەی .

بەهیچ شێوەیەک نابێت بەبێ ڕاچێتەی دکتۆر بدرێت بە هیچ نەخۆشێک ، دەبێت زۆر ئاگاداری ئەو خاڵە بیت .

بە تێکەڵیش لەگەڵ ( Mifepristone ) هەیە .


NDC 0591-0780-05
Sucralfate Tablets
1 gram
Watson
Rx only


Sucralfate, Domperidone & Simethicone Suspension
Sucrafil Ds
Each 5ml contains:
Sucralfate USP 500 mg
Domperidone IP 5 mg
Simethicone IP 25 mg
Colour: Ponceau 4R
Dosage: As directed by the physician.
Storage: Store in cool, dry & dark place.
Keep out of the reach of children
SCHEDULE 'H' DRUG
WARNING : To be sold by retail on the prescription of a Registered Medical Practitioner only
SHAKE THE BOTTLE WELL BEFORE USE


SCIENCE Company
Bismuth Nitrate
Lab Grade
CSB1046
100 g
Lot: 1062557


100 ml
Sucralfate & Oxetacaine Suspension
SYORECH-O
SUSPENSION
RECH ELIST


Sucralfate Oral Suspension
1 g/10 mL
SHAKE WELL BEFORE USING
AVOID FREEZING
FOR ORAL ADMINISTRATION ONLY
Rx only
One 420 mL Bottle
amneal


MAJOR
Bismatrol
Chewable Tablets
Soothing, coating action provides fast relief for heartburn, indigestion, nausea, upset stomach and diarrhea
30 CHEWABLE TABLETS


NDC 49035-346-10
equate
Compare to Pepto-Bismol® Active Ingredient*
Stomach Relief
Pink Bismuth Subsalicylate 262 mg
Upset Stomach Reliever/ Antidiarrheal
Relieves:
Nausea
Heartburn
Indigestion
Upset stomach
Diarrhea
40 CAPLETS
Actual Size


Pfizer
CYTOTEC
Misoprostol
Tableta
200 mcg
Caja con 28 tabletas


40 F.C Tablets
Bisamin
Bismuth Subcitrate


1 Kit
Combipack of Mifepristone & Misoprostol Tablets
V-Bort
Kit


40 Film Coated Tablets
Bismuth Subcitrate Arya
Bismuth Subcitrate
Each tablet contains:
Bismuth Subcitrate equivalent to 120mg of Bismuth Oxide
ARYA Pharmaceutical Co.
Tehran-Iran

## گروپی پێنجەم :- Eradication of Helicobacteria Pylori

- ئەو دەرمانانەی کە بۆ تێکشکاندن و لەناوبردنی بەرکتریانی (H.Pylori) بەکاردێن ، چەند دەرمانانێک دەبێت پێکەوە بەکاربهێنرێن بۆ تێکشکاندنی ئەم بەکتریایە .

- سەرەتا هەندێک زانیاری دەخەینە ڕوو سەبارەت بە بەکتریای (H.Pylori) دواتر دەچینە سەر باسکردنی چارەسەرەکانی.

- H Pylori :- بەکتریایەکی گرام نێگەتیڤە و زۆربەی خەڵکی هەیانە ، باوترین هۆکاری تووشبوونی گەدە و دوانزەگرێ بە برین هۆکارەکەی ئەم بەکتریایە ، هەندێک کەس بەکتریاکەیان هەیە و هیچ نیشانەیەکیان نییە ، لە هەندێکیاندا چەند نیشانەیەک دەردەکەوێت کە باسی لێوە دەکەین . ئەگەر کەسێک ئەم بەکتریایەی هەبێت و چارەسەر وەرنەگرێت ئەوە ڕەنگە توشی برینی گەدە و دوانزەگرێی بکات ، ئەوانەی کێشەی گەدەیان هەیە و ناڕەحەتی کردوون زۆر گرنگە کە فەحس بکەن بۆ ئەوەی دڵنیابنەوە ئەم بەکتریایان هەیە یان نا.

- ئەم بەکتریایە ڕەنگە ببێتە هۆی :-
  - هەوکردنی گەدە
  - برینی گەدە و دوانزە گرێ

- ئەگەر بۆماوەیکی درێژ وابێت و چارەسەر نەکرێت ئەوا ڕەنگە ببێتە هۆی :-
  - کونبوونی گەدە
  - شێرپەنجەی گەدە.

- هەندێک لەو نیشانانەی کە ئەگەری هەیە لە کەسەکاندا هەبێت:-
  - دڵەکزە
  - زۆربوونی قرقێنە
  - ئاوسان و ئازاری ناوسک
  - زۆربوونی غازات
  - هەناسە کورتی (SOB)
  - دڵتێکچوون و ڕشانەوە ( ئەگەر کەسەکە تووشی برین بوو بێت ئەوا ڕەنگە ڕشانەوەکەی خوێنی لەگەڵ بێت)
  - هەستکردن بە ئازاری کۆڵنج
  - کەمبوونەوەی ئیشتیها و زوو هەسکتردن بە تێربوون
  - بێهێزی و ماندوویەتی
  - بوونی خوێن لە پیسایدا ، یان ڕەشبوونی پیسایی
  - کەمبوونەوەی ڕێژەی خرۆکە سوورەکانی خوێن و کەم خوێنی.

بەڵام مەرج نییە ئەگەر کەسێک یەکێ یان چەند نیشانەیەک لەمانەی هەبێت ئەوا بڵێین بەکتریای گەدەت هەیە ، بۆ دڵنیابینەوە کە بەکتریاکەی هەیە یان نا دەبێت فەحس بکات کەسەکە.

- گرنگترین ڕێگەکانی دەستنیشانکردنی ئەم بەکتریایە ئەمانەن :-

پشکنینی خوێن. ( Serology )

پشکنین لەڕێگەی پیسایی.( Stool Antigen Test )

پشکنین لەڕێگەی هەناسەوە.( Urea Breath Test )

* لانی کەم دەبێت دەبێت ( 6 کاتژمێر ) پێش فەحسەکە هیچ نەخۆیت و نەخۆیتەوە.

ناوبینی ( Endoscopy ) و وەرگرتنی نمونەیەک لە ڕووپۆشی گەدە ( Biopsy ) و دواتر چاندنی لە تاقیگە. ( Culture )

بەڵام لەڕێگەی خوێنەوە زۆر دەقیق نییە ، بۆیە باشتر وایە لە ڕێگەی پیسی یان هەناسەوە بکرێت نەخۆش هەبووە لە ڕێگەی خوێنە فەحسەکەی کردووە پۆزەتیف دەرچووە بەڵام لەڕێگەی پیسییەوە کردوویەتی نێگەتیف دەرچووە.

- ئاگاداربە / دوو هەفتە پێش ئەوەی فەحسەکە بکەیت نابێت هیچ دەرمانێکی دژە ترشەڵۆکی گەدە وەربگریت و چوار هەفتە پێش ئەوە نابێت هیچ دەرمانێکی دژەبەکتریا وەربگریت.

- چارەسەرەکان/

چارەسەری ئەم بەکتریایە بە وەرگرتنی سێ یان چوار دەرمان پێکەوە دەکرێت(Triple Therapy) or (Quadruple Therapy )

کە دەرمانەکان ئەمانەن:-

دەرمانێکی گروپی [ Lansoprazole ] (PPI) یان[Omeprazoe کە گروپی دووەم خوێندمان. لەگەڵ دوو دەرمانی دژەبەکتریا ، هەندێک جار دەرمانی چوارەمیش بەکاردێنین وەک لە گروپی (Mucosal Protect Agent) باسمانکرد کە ئەویش یەکێک لە شێوەکانی( Bismuth ) ە لە گروپی پێشوو ئاماژەمان پێدا کە بە سێ شێوەی جیاواز لە بازاڕەکاندا هەیە دەتوانن سەیری ڕەسمەکانی گروپی پێشوو بکەنەوە.

- Triple Therapy :- بەگشتی ئەم چارەسەرە زۆر باوە و بەکاردێت

- Lansoprazole 30 mg 1*2 (پێش نان 30 خولەک)
- Clarithromycin 500 mg 1*2 (لە ناو ناوەڕاستی ناندا)
- Tinidazole / Metronidazole 500 mg 1*2(دوای نان)
- هەندێک جار لەجێگەی ( Lansoprzole 30 mg ) ( Omeprazole 20 or 40 mg 1*2 ) بەکاردێت
- هەندێک جار لە جێگەی ( Tinidazole ) ( Amoxicillin 1gm ) بەکاردێت.

بە چەندین ناوی بازرگانی لە بازاڕدا هەیە بۆنمونە ( Gastro kit ) کە ئەم سێ دەرمانەی خوارەوەی تێدایە )تێکەڵ نەکراوە بەڵکو هەر دانەو بەجیایە بەڵام کراوەتە ناو یەک شریتەوە ، واتە سێ جۆر حەبی جیاوازمان هەیە لە شریتەکەدا.

( Clarithromycin & Tinidazole ) بۆ ماوەی ( 10 بۆ 14 ) ڕۆژ دەبێت بخورێت بەو شێوەیە.

Lansoprazole

بۆ ماوەی چوار بۆ شەش هەفتە دەبێت بەردەوام وەربگیرێت ، بۆ ئەوەی لەو ماوەیەدا ترشێتی گەدە کەم دەربدرێت.

- Quadruple Therapy

Lansoprazle 30 mg 1*2 ( 30 خولەک پێش نان)

Bismuth Subsalicylate 262 mg 2*4

دوو حب پێکەوە 6 سەعات جارێک ، بەشێوەی حەبی کرماندنە (Chewable Tablet) ، کێشە نییە لەگەڵ نان بخورێت یان بەبێ نان.

Metronidazole (Flagyl) 250 mg 1*4 دوای نان

Tetracycillin 500 mg 1*4

بە گەدەی بەتاڵ یەک کاتژمێر پێش نان یان دوو کاتژمێر دوای نان.

بەهەمان شێوەی سەرەوە Lansoprazole بۆ ماوەی 4 بۆ 6 هەفتە دەبێت بخورێت ، ئەو سێدانەکەی تر 10 بۆ 14 ڕۆژ.

- دەبێت کەسەکە چارەسەرەکان بەسەر یەکەوە بەکاربێنێت و نێوانیان نەخات ، ئەو دە یان چواردە ڕۆژە بەردەوام عیلاجەکانی بەڕێکی بخوات.
- دەبێت دوای 4 هەفتە لە چارەسەرەکان فەحس بکاتەوە بۆئەوەی دڵنیا بێت کە بەکتریاکەی ماوە یان نا.









## گرووپی شەشەم :- ڕەوانکەرەکان( Laxatives )

- کۆمەڵێک دەرمانن بۆ چارەسەری قەبزی بەکاردێن.

قەبزی :- خاو تێپەڕبوونی پیسییە بەڕێڕەوی ڕیخۆڵەکاندا تاوەکو زیاتر بمێنێتەوە زیاتر توند دەبێت و تەڕی و لینجییەکەی لەدەست دەدات.

- بەپێی پێکهاتە و شێوازی کارکردنیان دابەشدەبن بەسەر چوار گرووپی سەرەکیدا کە ئەمانەن:-

a. Stimulant Laxative

b. Bulk formatting Laxative

c. Lubricant (Stool Softners)

d. Osmotic Laxative ئێستاش هەر سەر بەو گرووپەیە و بەجیا باس دەکەین.

1. Stimulant Laxative :- ئەم دەرمانانەی خوارەوە سەربەم گرووپەن:

◊ Senna / Sennoside

◊ Bisacodyl

◊ Glycerin [Suppository] شاف

◊ Castor Oil

◊ Sodium Pico sulfate

◊ Aloe Vera

دەرمانەکانی ئەم گروپە لە ڕێگەی زیادکردنی جووڵەی ڕیخۆڵەکانەوە (Peristalsis) چارەسەری قەبزی کەسەکە دەکەن دەنوسێن بەو دەمارانەی کە کۆنترۆڵی جووڵەی ڕیخۆڵەکان دەکەن و جووڵەی ڕیخۆڵەکان زیاد دەکەن بەمەش پیسی بە شێوەیەکی خێراتر تێپەر دەبێت و کەسەکە قەبزییەکەی نامێنێت .

- دەرمانەکانی ئەم گروپە بەگشتی نابێت زیاتر لە (2 هەفتە) بەکاربهێنرێت ، ئەگەر بۆ ماوەی دوو هەفتە زیاتر بەکاربهێنرێت ئەوا ڕەنگە ببێتە هۆی کەمبوونەوەی تۆنی لووسە ماسولکەکانی ڕیخۆڵە گەورە ،بۆیە دەبێت بۆماوەی چەند ڕۆژێک بەکاربهێنرێت .

- نابێت لەگەڵ (Bisacodyl) شیر و ئەنتاسیدەکان بخورێت چونکە بیزاکۆدیل(Enteric Coated) ە ئەگەر شیر و ئەنتاسیدەکانی لەگەڵ بخورێت ئەوا لە گەدەدا شیدەبێتەوە و زیان بەگەدە دەگەیەنێت بۆیە دەبێت لانی کەم یەک کاتژمێریان بەین بێت ئەگەر بەکاریش هاتن .

- ئەگەر (Senna) یان (Bisacodyl) بەشێوەی حەب وەرگیرا ئەوا دەبێت شەو دوو حەب پێکەوە بخورێت بۆئەوەی بۆ بەیانییەکەی کە کەسەکە لە خەو هەڵدەستێت حەبەکانی کاری خۆیان بکەن ، ئەگەر بەشێوەی شاف بوو ئەوا بەیانیان یەک شاف بەکاردێت. گلیسیرینی شاف زۆر زوو کار دەکات لە ماوەی (15 بۆ 60 خوولەک) بۆیە دەبێت پێش یەک کاتژمێر لە پیسی کردن بەکاربێت .

- سینا(Senna) ڕەنگە ڕەنگی میز بگۆڕێت.

- **ئاگاداربە** / نابێت بەهیچ شێوەیەک ئافرەتی دووگیان (Castor Oil) بەکاربهێنێت ، چونکە هانی گرژبوونی منداڵدان دەدات ، بەڵام هەندێک جار شەوی پێش نەشتەرگەری بەکاردێت کە (Cervix Dilatation) دەکات .

2. Bulk Forming Laxative :- ئەم دەرمانانە سەر بەم گروپەن :

- ◊ Bran
- ◊ Methylcellulose
- ◊ Ispaghula Husk ( Fybogel )
- ◊ Sterculia + Frangula = Normacol

- دەرمانەکانی ئەم گروپە ڕیشاڵی خۆراکین ، لە چەند ڕێگەیەکەوە کاردەکات بۆ چارەسەرکردنی قەبزی کەسەکە ، کە وەکو جێڵێک دیواری ڕیخۆڵە گەورە دادەپۆشن بەمەش هەڵمژینی ئاو بۆ ڕیخۆڵەکان کەم دەکەنەوە و پیسیەکە زۆر توند نابێت ، هەندێکیان وا دەکەن کە بڕێکی زیاتر ئاو بێتە ناو ڕیخۆڵەکان لە ڕێگەی ئۆزمۆسسەوە ، بەمەش ڕێگر دەبێت لە تووند بوونی پیسیەکە و یارمەتی شلبوونەوەی دەدات .

- ئەو کەسانەی ئەم حاڵەتانەیان هەیە نابێت دەرمانەکانی ئەم گروپە بەکاربێنن :-
  - ∴ ئەوانەی کە لەسەر جێگەن و ناتوانن بجوڵێن .
  - ∴ ئەوانەی کێشەی گیرانی ڕێڕەوی کۆئەندامی هەرسیان هەیە.
  - ∴ ئەوانەی نیشانەی ڕیخۆڵە کوێرەیان هەیە و تەشخیس نەکراوە لەو کاتەدا نابێت پێی بدرێت .
  - ∴ ئەوانەی کێشەی قورسی شت قوتدانیان هەیە .

- دەرمانەکانی ئەم گروپە دەبێت لانی کەم کاتژمێر بۆ دوو کاتژمێر پێش چوونە ناو جێگە و پاڵکەووتن بخورێنەوە چوونکە مەترسی گیرانی ڕێڕەوی هەرسیان هەیە بە تایبەتی قورگ گیران ، بۆیە باشتر وایە بە ماوەیەکی زۆر پێش خەوتن و پاڵکەووتن بخورێن.
- دەرمانەکانی ئەم گروپە لانی کەم دەبێت ( 250 ml ) ئاوی بەدوادا بکرێت بۆ ڕێگری کردن لە ئەگەری ڕوودانی گیرانی ڕێڕەوی هەرس تا ئاوی زیاتر لەدواوە بخورێت باشترە .

3. Lubricant ( Stool Softners ) :- دەرمانەکانی ئەم گروپە ئەمانەن :

- ◊ Liquid Paraffin
- ◊ Docusate

دەرمانەکانی وەکو چەورکەر کاردەکەن و بەمەش جووڵەی پیسی ئاسانتر دەکەن و ڕێگری دەکات لە هەڵمژینی بڕێکی زۆر لە ئاو لەلایەن ڕیخۆڵەکانەوە بەمەش یارمەتی کەسەکە دەدات بۆ ئەوەی بەدوور بێت لە قەبزی.

4. Osmotic Laxative

دەرمانەکانی ئەم گروپە لە ڕێگەی کردەی ئۆسمۆسسەوە وا دەکەن کە بڕێکی زیاتر ئاو بێتە ناو ڕیخۆڵەکان و بەمەشپیسسیەکە زیاتر شل دەبێتەوە و کەسەکە ڕزگاری دەبێت لە قەبزی.

- دەرمانەکانی ئەم گروپە ئەمانەن :-

◊ Lactulose

- لە هەردوو گەردی شەکری گالەکتۆس و لاکتولۆس پێکدێت کە هەڵنامژرێن لەلایەن ڕیخۆڵەکانەوە.
- دوو ژەمە (12 کاتژمێر جارێک ) ) 15 ml ) وەردەگیرێت لەگەڵ نانداا.
- بۆ ئەو کەسانەی کە شەکرەیان هەیە کێشەی نییە چونکە شەکری هەڵنەمژاون بەڵام باشتر وایە بە ورياييەوە بەكاريبێنێت.
- هەروەها وەکو چارەسەرێک بۆ ئەوکەسانە بەکاردێت کە تووشی (Hepatic Encephalopathy) ژەهراوی بوونی جگەر بوون ، کە جگەر ناتوانێت خوێن لە ژەهرەکان پاک بکاتەوە بەپێی پێوویست ، چونکە ڕێژەی ئەمۆنیا لە خوێندا کەم دەکاتەوە .

◊ Polyethylene glyco (PEG) [ Movicol ] کە بۆ پاککردنەوە ڕیخۆڵە زۆر باشە .

----------------------------

دەبێت بە گوێرەی پێوویست بەکاربهێنرێت لە ئەگەری زۆر زۆر بەکارهێنانی ڕەوانکەرەکاندا ڕەنگە ئەمانە ڕووبدات :-

∴ وشکبوونەوە
∴ تێکچوونی هاوسەنگی ئایۆنەکان

----------------------------

❖ بۆ ئافرەتی دووگیان Bulk formating laxative

دەتوانرێت بەکاربهێنرێت بۆ نمونە وەکو Lactulose(Fybogel )

ئەمەش کاتەگۆری B دەتوانرێت بەکاربهێنرێت.

بۆ منداڵ (SUPP) Glycerin / Lactulose

-----------------------------------------------------

**ئاگاداربە /** ئەگەر کەسێک نیشانەکی تووشبون بەهەوکردنی ڕیخۆڵە کوێرەی هەبوو نابێت هیچ جۆرێک لە کۆرەکانی ڕەوانکەرەکانی پێبدرێت تا یەکلا دەبێتەوە ئایا هەوکردنی ڕیخۆڵەکوێرەی هەیە یان نا .

3- هانی پلی دواوەی ژێرمێشکەڕژێن دەدات بۆ دەردانی هۆرمۆنی دژەمیزتن ADH کە ئەم هۆرمۆنەش دەبێتە هۆی گرژبوونی موولولەکانی خوێن و واش لە گورچیلەکان دەکات کە بڕێکی زیاتر ئاو گلبدەنەوە Water retention ) ئەمانەش دەبنە هۆی بەرزبوونەوەی پەستانی خوێن.

4- هانی توێکلی ئەدرینالین گلاند دەدات بۆ دەردانی هۆرمۆنی Aldosteron کە ئەم هۆرمۆنەش هانی گورچیلەکان دەدات بۆ ئەوەی بڕێکی زیاتر لە Na+1 و ئاو گلبدەنەوە و ئەمانەش دەبنە هۆی بەرزبوونەوەی پەستانی خوێن.

ڕێگری کردن لە چالاکی Angiotensin 2 دەبێتە هۆی کەمکردنەوەی پەستانی خوێن و ڕێگری کردن لە بەرزبوونەوەی پەستانی خوێن ، کە لە وانەکانی داهاتوودا باسیان دەکەین بەڵام کە ئەم میکانیزمەتان زانی وانەکانی داهاتوو زۆر ئاسان دەبن ،

بۆیە سەرەتا باسی ئەمەم کردووە.

..............................................................................................

Cardiovascular Center : ئەم سەنتەرەشمان هەیە کە دەکەوێتە قەدی دەماخ ، کە لە لایەن چەن وەرگر و شوێنێکەوە ئاگادار دەکرێتەو بۆ ڕێکخستنی پەستانی خوین و لێدانی دڵ ، لەم ڕێگایانەوە ئاگاداردەکرێتەوە :-

1- Baroreceptor : کە دەکەوێتە Aortic Arch و Carotid Sinus

کاتێک کە پەستانی خوێن بەرزدەبێتەوە یان دادەبەزێت ئەم وەرگرە لەڕێگەی ئەو پەستانەوە ئاگاداردەکرێتەوە ئەمیش لەڕێگەی Vagus nerve و Glossopharyngeal nerve کاردیۆڤاسکولەر سێنتەر ئاگاداردەکاتەوە بۆ ڕێکخستنی لێدانی دڵ و کەم کردنەوەی پەستانی خوێن ، Cardiovascular Centre لە ڕێگەی پاراسیمپاساتیک نێرڤ سێڵەوە ئەم کارە ئەنجامدەدات و لێدانی دڵ هێواش دەکاتەوە و دەبێتە هۆی خاوبوونەوە و فراوانبوونی لوولەکانی خوێن ، هەروەها بە پێچەوانەشەوە لەکاتی دابەزینی پەستانی خوێندا هانی دەدات بۆ بەرزکردنەوەی پەستانی خوێن لە ڕێگەی زیادکردنی لێدانی دڵ و گرژبوونی لوولەکانی خوێن ، لە ڕێگەی سیمپاساوی نێرڤ سێڵەکانەوە.

کاتێک کەسێک تووشی SVT دەبێت کارۆتید مەساجی بۆ دەکرێت بۆئەوەی Baroreceptor هانبدرێت بۆ ئەوەی خێرای لێدانی دڵ کەم بکاتەوە.

2- Chemoreceptor : لە Central & Pheripheral هەن

لە Peripheral دا دەکەونە Aortic Arch & Carotid Sinus

ئەوانەی کە لە Peripheral دا هەن لە ڕێگەی Ph و خەستی O2 ئاگاداردەرێنەوە ، ئەوانەشی کە لە Central ( Brain ) دا هەن لە ڕێگەی Ph و خەستی CO2 ئاگادار دەکرێنەوە ، ئەمانەش بە هەمان شێوە هانی Cardiovascular Center دەدەن بۆ هاوسەنگکردنەوەی تێکڕای لێدانی دڵ و کشانی لوولەکانی خوێن ، بەهەمان شێوە لە ڕێگەی سمپاساوی و پاراسمپاساوییەوە ئەم کارەدەکەن ئەمانیش بە هەمان شێوەی سەرەوە.

کاتێک کەسێک ڕایەکی زۆر دەکات و ماندوو دەبێت بڕی CO2 لە خوێنیدا زیاد دەکات و بڕی O2 لە لەشیدا کەم دەکات ، لەو کاتەدا لێدانی دڵی زیاد دەکات بۆ هاوسەنگکردنەوەیان.

بەگشتی ئەوە بزانن کە ئەم سەنتەر لە ڕێگەی سمپاساوی و پاراسمپاساوی و کاردەکات بۆ هاوسەنگکردنەوەی تێکڕای لێدانی دڵ و فراوانی لوولەکانی خوێن و پەستانی خوێن.


Angiotensin I
Angiotensin II
Liver
Angiotensinogen
Acts on
Renin
Lungs
Angiotensin converting Enzyme (ACE)
Adrenals
Aldosterone
Heart
Kidney
Sodium & Water Retention
Increased BP
Vasoconstriction
Arteries


Baroreflex
NTS
Parasympathetic
LOW
NORMAL
HIGH
Sympathetic
3:13


Chemoreceptors
Central
Brain
stimulated by pH and Pco2
Peripheral
carotid & aortic bodies
stimulated by pH and Po2


CARDIAC OUTPUT
BYJU'S
CARDIAC OUTPUT
Heart Rate (beats/min)
Nerves
Hormones
Stroke Volume (ml/beat)
Blood Volume
Vascular resistance


Circulatory Homeostasis
Tissue perfusion is driven by blood pressure
BP = CO X PVR
CO – Cardiac Output
PVR – Peripheral Vascular resistance

# سیستەمی دووەم ؛ Cardiovascular System

## گروپی یەکەم :- Angiotensin Converting Enzyme Inhibitor ( ACEI )

دەرمانەکانی ئەم گروپە چالاکی Angiotensin Converting ( ACE ) Enzyme ڕادەگرن ، وەکو لە وانەی پێشوودا باسمان کرد کە ئەم ئەنزیمە لەلایەن سییەکان و چەند ئەندامێکی تریشەوە دەردەرێن ، دەرمانەکان ئەم گروپە چالاکی ئەم ئەنزیمە ڕادەگرن.

بابزانین ئەم ئەنزیمە چ کارێکدەکات :-

1- ئەم ئەنزیمە AT1 دەگۆڕێت بۆ AT2
2- ( Angiotensin1 + ACE = Angiotensin2 )

وەکو لەوانەی پێشووشدا باسمانکرد Angiotensin2 دەبێتە هۆی بەرزبوونەوەی پەستانی خوێن لە چەند ڕێگەیەکەوە دەتوانن دووبارە بچن سەیری بکەنەوە.

1. ڕێگری کردن لە بەرهەمهێنانی Angiotensin 2 دەبێتە هۆی کەمکردنەوەی پەستانی خوێن و ڕێگری کردن لە بەرزبوونەوەی پەستانی خوێن .
2. ئەم ئەنزیمە دەبێتە هۆی تێکشکاندنی Bradykinin کە ئەمەش Vasodilatorە و لوولەکانی خوێن فراوان دەکات و ڕێگری دەکات لەبەرزبوونەوە پەستانی خوێن و یارمەتی دابەزاندنی پەستانی خوێن دەدات.

ئەگەر ڕێگری بکەین لە کاری ئەو ئەنزیمە ئەوا ڕێگری دەکەین لە تێکشکاندنی Bradykinin و ڕێژەکەی بەرزدەبێتەوە کە وەکو ووتومانە ڤاسۆدایلیتەیشن دەکات .

Kaka Lea

.................................................................................

دەرمانەکانی ئەم گروپە بۆ ئەم حاڵەتانە بەکاردێن :-

1) بەرزی پەستانی خوێن ( HT ) Hypertension
2) پەککەوتنی دڵ ( CHF ) Congestive Heart Failure
3) ئەوانەی جەڵدەی دڵ لێیداون بۆ ڕێگری کردن لە پەککەوتنی دڵیان Post MI
4) بەسوودە بۆ ڕێگری کردن لە توشبوون بە Diabetic Nephropathy وە چارەسەرکردنی.

.................................................................................

دەرمانەکانی ئەم گروپە بەوە دەناسرێنەوە کە کۆتاییەکەیان بە ( Pril ) دێت ، دەرمانەکان ئەمانەن :-

- Captopril
- Enalapril
- Lisnopril
- Ramipril
- Perindopril
- Fosinopril
- Benazepril
- Quinapril

چەند دەرمانێکی تریشن کە بەهەمان شێوە کۆتاییەکانیان هەر بە Pril هاتووە بەڵام زیاتر ئەمانە باون ، بەتایبەتی لای خۆمان ئەو 5ی سەرەتا باون.

بەتێکەڵیش لەگەڵ دەرمانی تردا هەیە کە بە وانەیەکی جیا باسی ئەوانە دەکەین کە بەشێوەی تێکەڵ هەن.

* بەگشتی دەرمانەکانی ئەم گروپە ئەکەم دۆزی دەبێتە هۆی دابەزاندنی پەستانی خوێن ( Hypotension ) بۆ ڕێگری کردن لە ڕوودانی ئەم دەتوانین ئەم دوو خاڵە ئەنجام بدەین :-

- باشتر وایە یەکەم دۆزی شەو پێش خەوتن بخورێت.
- بۆ ماوەی یەک بۆ دوو هەفتە بە دۆزی کەم دەستپێبکرێت سەرەتا دوای ئەوەی کە کەسەکە ڕاهات لەگەڵی دەتوانێت دۆزەکەی زیادبکرێت.

*ئەگەر کەسێک کێشەی گورچیلەکانی هەبوو دکتۆر بەپێویستی زانی کە دەرمانێکی ئەم گروپەی بۆ بنوسێت دەبێت سەرەتا تێستی S.Creatinine بۆ بکات دەبێت دوای حەوت ڕۆژ تێستەکە دووبارە بکاتەوە بۆ ئەوەی بزانێت دەرمانەکە بووەتە هۆی زیاتر بەرزبوونەوەی S.Crea ئەگەر ڕێژەکەی لەچاو پێشووتردا بووبوو بە دوو ئەوەندە دەبێت بیوەستێنێت ، بۆنمونە سەرەتا 2 بووە دوای هەفتەیەک لە چارەسەر بووە بە 4.

ئەگەر ئەوەندە و نیوێک زیادی کردبوو دکتۆرەکە پێی وابوو هەر دەبێت بردەوام بێت لەسەری ئەوا دەبێت دۆزەکەی کەم بکاتەوە بۆ نیوە ، بۆنمونە سەرەتا 2 بووە ئێستا بووە بە 3.

ئەگەر بە ڕێژەی 25% یان کەمتر زیادی کردبوو دەتوانێت بەهەمان دۆز بەردەوام بێت .

دەبێت بەردەوام ئاگاداری ئەوە بێت و دکتۆرەکەی بۆ دیاری دەکاتە کە چەنێک جارێک تێستەکەی بکاتەوە.

..............................................................................

زیانە لاوەکییەکانی ئەم دەرمانانە ئەمانەن :-

- باوترین زیانی لاوەکی بریتیە لە کۆکەی ووشکی بەردەوام (Persistent Dry Cough) کە بەهۆی بەرزبوونەوەی ڕێژەی Bradykinin وە ڕوودەدات ، کە 10% بۆ 20% کەسەکان تووشی دەبن ، کەسەکە تووشی کۆکەیەکی ووشکی بێزارکەر دەبێت هەندێک جار تەنها بە وەستاندنی دەرمانەکان نامێنێت ، بە چارەسەری دژە کۆکەکانیش لاناچێت ، یەکێک لە هۆکارەکان ئەوەیە کە ئێستا دەرمانەکانی ئەم گروپە کەمتر دەنوسرێت لەلایەن دکتۆرەکانەوە.
- Angioedema : ڕەنگە ببێتە هۆی ئاوسانی لێو و زمان و لووت و قەپاتکردنی ڕێڕەوی هەناسە ئەمەش بەهۆی بەرزبوونەوەی ڕێژەی Bradykinin وە ڕوودەدات ، هەرکاتێک ئەم نیشانەی تێدا دەرکەوت دەبێت کەسەکە وازلەبەکارهێنانی بهێنێت.

ئەگەر کەسەکە تووشی ئەمە بووە دەتوانێت بە Antihistamine کان چارەسەر بکرێت ، ئەگەر زۆر بەخراپی تووشی بوو ئەوا بە Norepinephrine چارەسەر دەکرێت . هەر بۆیە ئەگەر کەسێک ئەم کێشەیەی هەبێت نابێت دەرمانەکانی ئەم گروپەی پێبدرێت.

- Hyperkalemia : ڕەنگە ببێتە هۆی زیادبوونی ڕێژەی پۆتاسیۆم ، بەتایبەتی لەو کەسانەی کە پۆتاسیۆم بەشێوەی سەپلیمێنت وەردەگرێت یان ئەوانەی کە دەرمانەکانی گروپی K+ sparing diuretics کە دواتر باسی دەکەین ، بۆیە نابێت ئەم دەرمانانە لەگەڵ ئەو دووانە بەکاربێن کە باسمان کرد.

- Teratogenicity: ڕەنگە بێتە هۆی ناتەواوی منداڵەکە یان مردنی منداڵەکە ئەگەر دایکی دووگیان بەکاربێنێت بە تایبەتی لە ترایمیستەی دووەم و سێیەمدا ، بۆیە دەرمانەکانی ئەم گروپە نابێت بۆ ئافرەتی دووگیان بەکاربێت.
- پەڵەی پێست.
- سەرئێشە.
- دڵتێکچوون و ئازاری ناوسک.
- بوونی پرۆتین لە میزدا زیاد لە ئاستی ئاسای خۆی.

*بەکارهێنانی دەرمانەکانی ئەم گروپە وەکو Captopril لەگەڵ Digoxin ڕەنگە ببێتە هۆی زیادبوونی ڕێژەی دیجۆکسین لە خوێندا بۆیە نابێت پێکەوە بەکاربهێنرێن.

.........................................................................................

زانیاری زیادە/ ڤایرۆسی کۆرۆنا و سارس لە ڕێگەی ACE2 دەچنە ناو ئەو خانانەی کە مەبەستیانە بۆ نموونە خانەکانی سییەکان ، بۆیە هەتاوەکو ACE2 کەم بکەینەوە چانسی چونە ژوورەوەی ڤایرۆسەکە کەمتر دەبێت .

یەکێک لەو دەرمانانەی کە ئەم کارەدەکات کار دەکاتە سەر ACE2 دەرمانەکانی ئەم گرپەیە ، بۆیە ئەوانەی کە دەرمانەکانی ئەم گروپە بەکاردێنن نابێت بەبێ پرسی دکتۆر وازلەبەکارهێنانی دەرمانەکەی بێنێت بە تایبەتی لەم کاتەدا و وە لەو ناوچانەی کە ڤایرۆسەکەی تێدا بڵاوبووەتەوە.

بەڵام ئەمەش مانای ئەوە نییە کە چارەسەرە بۆ کۆرۆنا نەخێر وانییە تەنها ئەوانەی کە خۆیان هەیانە و دکتۆری بۆی نوسیوون دەبێت بەکاریبێنن بۆئەوەی بارودۆخیان خراپتر نەبێت چونکە یەکێک لەوانەی کە مەترسی توشوونیان بەشێوەیەکی سەخت لەسەرە ئەو کەسانەن کە کێشەی دڵ یان زەختیان هەیە.























## گرووپی دووەم :- Angiotensin 2 Receptor Antagonists ( ARBs / A2RBs )

دەرمانەکانی ئەم گرووپە لەڕێگەی بلۆکردنی ( AT1 Receptor ) Angiotensin 1 Receptor کاردەکەن و ڕێگری لە چالاکی AT2 دەکەن. وەکو لە وانەکانی پێشوودا باسمان کردووە AT2 دەبێتە هۆی گرژبوونی لوولەکانی خوێن و هانی دەردانی هۆرمۆنی ئەڵدۆستیرۆن و دژە میزتن دەدات و وا لە گورچیلەکان دەکات بڕێکی زیاتر لە سۆدیۆم و ئاو گلبدەنەوە ، ئەگەر ڕێگری لە چالاکی AT2 بگرین ئەوا ڕێگری دەکەین لە ڕوودانی ئەوانەش.

- بابزانین AT1 Receptor لە چ شوێنێکدا هەیە :- لە چەند شوێنێکی لەشدا هەیە وەک ( دڵ ، لوولەکانی خوین ، گورچیلەکان ، توێکڵی ئەدرینالین ، مێشک ، چەند شوێنێکی دی )

.............................................................................

دەرمانەکانی ئەم گرووپە بۆ ئەم حاڵەتانە بەکاردێن :-

1- بەرزی پەستانی خوێن ( HT ) Hypertension
2- پەککەوتنی دڵ Congestive Heart Failure ( CHF )
3- MI

بۆ ڕێگری کردن لە ڕوودانی جەڵدەی دڵ یان ئەوانەی جەڵدەی دڵ لێیداون بۆ ڕێگری کردن لە پەککەوتنی دڵیان Post MI

4- بەسوودە بۆ ڕێگری کردن لە توشبوون بە Diabetic Nephropathy وە چارەسەرکردنی.

- دەرمانەکانی ئەم گرووپە بەوە دەناسرێنەوە کە کۆتاییەکەیان بە (Sartan) دێت ، دەرمانەکان ئەمانەن :-

Candisartan ( Atacand / Blopress ) [4mg , 8mg , 16mg , 32mg ]

Losartan ( Angizar ) [ 25mg , 50mg , 100mg ]

Valsartan [80mg , 160mg , 320mg ]

Irbisartan [ 75mg , 150mg , 300mg ]

Telmisartan ( Micardis ) [ 20mg , 40mg , 80 mg ]

--------------------------------------------------------

Olmesartan [5mg , 10mg , 20mg , 40mg ]

Azilsartan [40mg , 80mg ]

Eprosartan [400mg , 600mg ]

Fimasartan [60mg , 120mg ]

--------------------------------------------------------

**زانیاری گرنگ** / Angiotensin II بە شێوەی سڵوشن و دەرزی هەیە کە لەلایەن FDA ئەپرۆڤکراوە بۆ بەرزکردنەوەی پەستانی خوێن لە پێگەشتواندا ، ئەو کەسانەی کە پەستانی خوێنیان زۆر دادەبەزێت و مەترسی دەکەوێتە سەر ژیانیان ، بۆ نمونە ئەوانەی تووشی سێپتیک شۆک دەبن.

*لای خۆمان زیاتر ئەو 5ی سەرەوە باون.

*ئەوانەی ناو کەوانەکە ناوی بازرگانین.

*بەتێکەڵیش لەگەڵ دەرمانی تردا هەیە کە بە وانەیەکی جیا باسی ئەوانە دەکەین کە بەشێوەی تێکەڵ هەن.

* بەهەمان شێوەی گروپی پێشوو هەر کەسێک کێشەی پەککەتنی گورچیلەکانی هەبوو ، وەکو لە وانەی پێشوودا باسمان کردووە ئەگەر دوای 7 ڕۆژ S.Crea بووە بە دوو ئەوەندە دەیوەستێنین ، ئەگەر بوو بە ئەوەندەونیوێک دۆزەکەی کەم دەکەینەوە بۆ نیوە ، ئەگەر بوو یەک لەسەر چوار یان کەمتر بوو دەتوانین بەهەمان دۆز بەردەوام بین.

*لایەنێکی باشی دەرمانەکانی ئەم گروپە ئەوەیە کە نابێتە هۆی بەرزبوونەوەی ڕێژەی Bradykinin ، کە لە گروپی پێشوودا بەدیتەڵی باسمان کردووە.

کە ڕێژەی Bradykinin بەرز نەبوویەوە ئەوا کەسەکەی ئەگەر تووشبوون بە Dry Cough & Angioedema کەم دەبێتەوە یان بابڵێین هەر نامێنێت ، یەکێک لەو هۆکارانەی کە ئێستا دەرمانەکانی ئەم گروپە زیاتر دەنوسرێت وەکو لە گروپی پێشووتر ئەم خاڵەیە.

*بەگشتی دەرمانەکانی ئەم گروپە زۆر باون و دکتۆرەکان زیاتر دەرمانەکانی ئەم گروپە بەکاردێنن وەک لە گروپی ACEI . بەتایبەتی بۆ کۆنترۆڵکردنی پەستانی خوێن کۆمەڵە دەرمانێکی زۆر باشن.

*بەگشتی Candesartan لەم گروپەدا فێرست چۆیسە بۆ کۆنترۆڵکردنی پەستانی خوێن ، ئەگەر ئەمە کاریگەی کەمبوو پەستانی خوێنی کەسەکە هێشتا هەربەرزبوو دوای هەفتەیەک لەچارەسەر ئەوا دەتوانرێت Telmisartan بەکاربهێنرێت کە بەشێوایەکی زۆر دیاریکراو AT1 Receptor بلۆک دەکات و half life زیاترە و کاریگەری زیاتر هەیە.

چۆن بڕیار دەدەیت کە کەسەکە ئەو حەبەی بەکاریدێنێت ئیفێکتقە یان نا ، دەبێت بۆماوەی هەفتەیەک ڕۆژی دووجار 12 کاتژمێر جارێک بەیانی ئێوارە پەستانی خوێن بپێوێت بۆ ئەوەی بزانێت ئەو حەبەی کە دەیخوات سوودی لێدەبینێت و پەستانی خوێنەکەی کۆنترۆڵ دەکات یاخود نا .

* Telmisartan & Olmesartan ڕەنگە ببنە هۆی زیادبوونی insulin sensitivity وا لەخانەکان دەکات کە وەڵامدانەوەی باشیان هەبێت بۆ insulin زیادبوونی وەڵامدانەوەی خانەکانیش بۆ insulin دەبێتە هۆی کەمبوونەوەی ڕێژەی شەکر لە خوێندا.

* Losartan کاردەکاتە سەرکەمکردنەوە ڕێژەی Serum Uric Acid و دەرکردنی ڕێژەی یوریک ئەسید لە میزدا زیاددەکات ، بۆیە دەتوانین بڵێین بۆ ڕێگری کردن لە تووشبوون بە نەخۆشی ( Gout ) دەردەپاشاش بەسوودە کە ڕێژەی یوریک ئەسید زۆردەبێت لە جومگەکاندا دەنیشێت ، بەڵام چارەسەری ترمان هەیە بۆ ئەو نەخۆشییە ئەمە چارەسەر نییە بەس وەکو زانیارییەک بۆ ئەوەی بزانن ئەو کاریگەریەشی هەیە.

*بەشێک لە دەرمانەکانی ئەم گروپە Nitrosamines (NDEA&NDMA) یان تێدابوو کە ماددەیەکی کارسینۆجینە و ئەگەری توشبوون بە ژێرپەنجە زیاد دەکات ، بەڵام لە دەرمانەکانی هەموو شەریکەکاندا ئەم ماددەیە بوونی نەبوو بۆیە تەنها ئەو شەریکانە قەدەغە کران و دەرمانەکانیان لە بازارەکانی جیهاندا گەڕێندرانەوە کە ئەم ماددەی تێدابوو ، زیاتر لە دەرمانەکانی Valsartan و IrbesartanوLosartan دا هەبوون ، بەڵام وەکو ووتمان لە دەرمانەکانی هەموو شەریکەکاندا نەبوون تەنها ئەو شەریکانە نەبێت کە ئەو ماددەیەی تێدابووە ، ئەو دەرمانانە لە بازاڕەکاندا نەماوە و قەدەغە کراون.

زیانەلاوەکییەکان :-

- ∴ Teratogenicity لە ماوەی دووگیانیدا نابێت بەکاربێت
- ∴ Hypotension دابەزینی پەستانی خوێن
- ∴ Hyperkalemia بەرزبوونەوەی ڕێژەی پۆتاسیۆم

بەتایبەتی لەو کەسانەی کە سەپلیمێنتی پۆتاسیۆم بەکاردێنن یان k+ Sparing Diuretics بەکاردێنن بۆیە نابێت پێکەوە بەکاربێن.

- ∴ بێهێزی و گێژبوون.
- ∴ سەرئێشە.

- Drug interactions دەرمانەکانی ئەم گروپە لەگەڵ چ دەرمانێکی تردا کارلێک دەکەن ؟

*باشتر وایە دەرمانەکانی ئەم گروپە لەگەڵ NSAIDs بەکارنەهێنرێت پێکەوە چونکە ڕەنگە کێشە بۆ گورچیلەکان دروستبکەن و هەروەها ڕەنگە کاریگەری Antihypertensive ی دەرمانەکان کەم بکەنەوە و کەسەکە پەستانی خوێن دانەبەزێت و ئاسای نەبێت.

* Telmisartan & Digoxin نابێت پێکەوە بەکاربهێنرێت چونکە ڕەنگە ببێتە هۆی ژەهراوی بوون بە Digoxin.

* Candesartan & Lithium نابێت پێکەوە وەربگرێن ڕەنگە ببێتە هۆی لیسیۆم تۆکسیسیتی.

Losartan لەگەڵ ئەم دەرمانانەدا کارێک دەکات نابێت پێکەوە بەکاربێن Kaka Lea

Cimetidine , Fluconazole , Rifampin , Phenobarbital

---

زانیاری زیادە/ ڤایرۆسی کۆرۆنا و سارس لە ڕێگەی ACE2 دەچنە ناو ئەو خانانەی کە مەبەستیانە بۆ نموونە خانەکانی سییەکان ، بۆیە هەتاوەکو ACE2 کەم بکەینەوە چانسی چونە ژوورەوەی ڤایرۆسەکە کەمتر دەبێت .

یەکێک لەو دەرمانانەی کە ئەم کارەدەکات کار دەکاتە سەر ACE2 دەرمانەکانی ئەم گرپەیە ، بۆیە ئەوانەی کە دەرمانەکانی ئەم گروپە بەکاردێنن نابێت بەبێ پرسی دکتۆر وازلەبەکارهێنانی دەرمانەکەی بێنێت بە تایبەتی لەم کاتەدا و وە لەو ناوچانەی کە ڤایرۆسەکەی تێدا بڵاوبووەتەوە.

بەڵام ئەمەش مانای ئەوە نییە کە چارەسەرە بۆ کۆرۆنا نەخێر وانییە تەنها ئەوانەی کە خۆیان هەیانە و دکتۆری بۆی نوسیوون دەبێت بەکارییبێنن بۆئەوەی بارودۆخیان خراپتر نەبێت چونکە یەکێک لەوانەی کە مەترسی توشوونیان بەشێوەیەکی سەخت لەسەرە ئەو کەسانەن کە کێشەی دڵ یان زەختیان هەیە.

## گرووپی سێیەم -: (Beta Adrenergic Blocking Agents) Beta Blockers

دەرمانەکانی ئەم گرووپە وەرگری ئەدرینالین و نۆرئەدرینالین بلۆک دەکەن و بەمەش ڕێگری دەکەن لە کاری ئەو دوو هۆرمۆنە.

سێ جۆر وەرگری بێتامان هەیە:-

1) Beta 1 ( β1 ) Receptor بەگشتی لە دڵ و گورچیلەکاندا هەن.
2) Beta 2 ( β2 ) Receptor بەگشتی لە سییەکاندا هەن ، هەروەها لە لولەکانی خوێن و چاو و لووسە ماسولکەکانی منداڵدان و میزڵدان و ڕێڕەوی هەرس ، جگەر و پەیکەرە ماسولکەشدا هەن.
3) Beta 3 ( β3 ) Receptor لە خانە چەورییەکاندا هەن.

* بۆ ئەوەی لەبیرتان نەچێت کە β1 & β2 لە کوێدا هەن ، β1 لە دڵدا هەیە دڵ یەک دانەیە ، β2 لە سییەکاندا هەیە دوو سیمان هەیە.

تێبینییەکی گرنگ / دەرمانەکانی ئەم گرووپە بەوە دەناسرێنەوە کە کۆتاییەکەیان بە ( olol / lol ) دێت.

دەرمانەکانی ئەم گرووپە دابەشدەبن بەسەر سێ کۆمەڵە ( جێنێرەیشن )ی سەرەکیدا :-

1. جێنێرەیشنی یەکەم -: Non Selective β Blockers
دیاریکراو نییە تەنها β1 بلۆک بکات بەڵکو β1 & β2 هەر دووکیان بلۆک دەکات
دەرمانەکانی ئەم کۆمەڵەیە ئەمانەن :-
   - Propranolol ( Inderal )
   - Timolol
   - Sotalol
   - Nadolol
   - Pindolol
   - Carteolol
   - Penbutolol
   - Oxprenolol
   - Levobunolol

2. جێنێرەیشنی دووەم -: Selective β1 Blocker دەرمانەکانی ئەم کۆمەڵەیە تەنها β1 بلۆک دەکەن
دەرمانەکانی ئەم کۆمەڵەیە ئەمانەن :-
   - Bisoprolol ( Concor )
   - Metoprolol ( Betaloc )
   - Nebivolol
   - Atenolol
   - Esmolol
   - Betaxolol
   - Celiprolol
   - Acebutolol

3. جێنێرەیشنی سێییەم -: Vasodilating

دەرمانەکانی ئەم کۆمەڵەیە بەشێکیان Selective ن و بەشێکیشیان non seective ن بەڵام لەگەڵ β دا Alpha 1 نیش بلۆک دەکەن کە لە خوێنبەرەکاندا هەن ، خوێنبەرەکان نایتریک ئۆکساید دەردەدەن بەمەش دایلیتەیشن ڕوودەدات هەر بۆیە بەو ناوەشەوە ناسراون ، PVR کەم دەبێتەوە وەکو لە وانەی پێشەکی ئەم سیستمەدا باسمان کردووە کە PVR کەم بێتەوە BP دادەبەزێت ، بۆیە دەرمانەکانی ئەم گروپە بۆ کۆنترۆڵکردنی BP بەکاردێن .

دەرمانەکانی ئەم کۆمەڵەیە ئەمانەن -:

A. Non Selective :-

- ◊ Carvedilol
- ◊ Labetalol
- ◊ Carteolol

B. Selective :-

- ◊ Nebivolol
- ◊ Betaxolol
- ◊ Nebivolol

یەکێک لە ناوە بازرگانییەکانی ( Bystolic ) ە By واتە دوو ، Stolic مەبەست لێی پەستانی خوێنە ، واتە لە دوو ڕێگەوە کاردەکات بۆ دابەزاندنی پەستانی خوێن ، لە ڕێگەی بلۆککردنی β1 و کەمکردنەوەی لدانی دڵ و هەروەها لەڕێگەی بلۆککردنی Alpha1 و دایلیتەیشنی خوێنبەرەکانەوە کەمکردنەوە PVR ئەم کارە ئەنجام دەدات.



- دەرمانەکانی ئەم گروپە بەگشتی بۆ ئەم جۆرە کەیسانە بەکاردێن -:

بەرزە پەستانی خوێنیان هەیە ( HT ) ، دەبێتە هۆی کەمکردنەوەی لێدانی دڵ بەمەش Cardiac Output کەمدەبێتە و پەستانی خوێن کەمدەبێتەوە ، هەروەها دەبێتە هۆی کەمتر دەردانی ڕێنین لەلایەن گورچیلەکانەوە ئەمەش بەهەمان شێوەیە دەبێتە هۆی دابەزاندنی پەستانی خوێن ، بۆنمونە Bisoprolol دەبێتە هۆی کەمکردنەوە دەردانی ڕێنین بە ڕێژەی 65%.

زەبحەی دڵ ( Angina Pectoris )

نارێکی لێدانی دڵ ( Arrhythmias ) بۆنمونە ( AF ) ، هەروەها بۆ کەمکردنەوەی لێدانی دڵیش ( Tachycardia ) بەکاردێت.

ئەوانەی جەڵدەی دڵیان هەبووە ( Post Heart Attack Care )

پەککەوتنی دڵ ( HF ) ، بەڵام بۆ ئەم حاڵەتەیان جگە لەم دەرمانانە

( Bisoprolol , Metoprolol Succinate , Carvedolol )

بەگشتی ئەم سێ دەرمانە دەتوانین بەکاربێنێن ، Nebivolol یش دەتوانرێت بەکاربهێنرێت بەڵام بەگشتی ئەو سیانەی سەرەوە بەکاردێت ، بەڵام ئەوانی دیکە Contraindicated نابێت بەکاربێن .

* بۆ کۆنترۆڵکردنی نیشانەکانی :-

قەلەقی ، بەگشتی β blockers بۆ ئەم حاڵەتە بەکاردێت ، بەڵام بەتایبەتی Propranolol زیاتر بۆ ئەم مەبەستە بەکاردێت ، بۆنمونە ئەوانەی کە سیمینار یان یان بۆنەیەکی گرنگیان هەیە و قەلەقن و دەستیان دەلەرزێت و ئارەق دەکەنەوە ئەمە بەکاردێنن بۆ ئەوەی ئەو حاڵەتەیان نەمێنێت.

هایپەرسایرۆدیزم ( غودەی زیرەک) ئەوانەی کە TSH یان کەمە ، بە تایبەتی Propranolol زیاتر بۆ ئەم مەبەستە بەکاردێت ڕێگری دەگات لەوەی کە T4 بگۆڕدرێت بۆ. T3

بەشێوەیەکی بەردەوام بەکاردێت بۆ ڕێگریکردن و چارەسەری شەقیقە ( Migraine ) ، بەتایبەتی Propranolol زیاتر بۆ ئەم مەبەستە بەکاردێت چونکە دەتوانێت تێپەربێت بە Blood Brain Barrier دا ، دەرمانی تریش هەیە بەهەمان شێوەی ئەمە بەڵام زیاتر ئەمەیان بەکاردێت ، بۆنمونە Metoprolol & Nadolol

*هەندێک لە β blockers بەشێوەی قەترە بەردەستن بۆ کەمکردنەوە بەرزە پەستانی چاو و ڕێگریکردن لە تووشبوون بە

Glaucoma بەکاردێن ، بۆ نمونە ( Timolol ، Betaxolol ، Carteolol , Levobunolol , Metipranolol )

مەرج نییە بەتەنها بن کە بۆ ئەم مەبەستە بەکارهێنرێن ڕەنگە لەگەڵ ماددەی تردا تێکەڵ کرابێت و کرابێتە قەترە بۆ ئەوەی ئیفێکتی زیاتریان هەبێت پێکەوە.

* Esmolol : بە IV دەکرێت بۆ چارەسەرکردنی ئەو کەسانەی کە لێدانی دڵیان زۆر خرادەبێت بۆنمونە ئەوانەی تووشی SVT دەبن هەرچەندە چارەسەری ترمان هەیە بۆ ئەم حاڵەتە کە باوترن و زیاتر بەکاردێن بەڵام بزانن ئەمەش بەکاردێت بۆ ئەو حاڵەتە ، هەروەها بۆ چارەسەری خێرا لێدانی دڵ لەکاتی بەنجکردنی نەخۆش بۆ نەشتەرگەری یان لەناو نەشتەرگەریەکەدا یان دوای نەشتەرگەری ، هەروەها بۆ چارەسەری بەرزە پەستانی خوێنیش لەو حاڵەتانەدا دەتوانرێت بەکاربهێنرێت ، یان بۆ چارەسەری Rapid AF & Flutter . زۆر بەخێرای کاردەکەن بەڵام کاریگەریان زوو نامێنێت Rapid Onset & Very Short Duration Of action

* Sotalol : بەهەمان شێوە ئەمیش بەکاردێت بۆ کەمکردنەوەی لێدانی دڵ ، بۆنمونە ئەوانەی توشی

Vetricular Tachycardia

Rapid AF & Flutter

هەروەها Class III Anti-arrhythmic کیشە لە هەمان کاتدا ، دەتوانرێت بە شێوەیەکی هەمیشەی بدرێت بەوانەی

Ventricular & Superaventricular arrhythmias هەیە

*جاری وا هەیە دکتۆر بۆ هەفتەی سەرەتا بە دۆزێکی کەمتر بۆی دەنوسرێت و دوای ئەوەی دۆزەکەی زیاد دەکات بۆی بۆ ئەوەی کەسەکە ڕابێت لەگەڵی و ڕاستەوخۆ توشی کێشەی گەورەی نەکات.

*دوو جۆر Metoprolol مان هەیە :-

Metoprolol Tartrate ( Short Acting 1*2 )

Metoprolol Succinate ( Long Acting 1*1 )

زیانەلاوەکییەکان :- Non Selective

ئەم کۆمەڵەیان بەهیچ شێوەیەک نابێت بۆ ئەو کەسانە بەکاربهێنرێت کە ڕەبۆ( Asthma ) یان COPD یان هەیە چونکە β2 ش بلۆک دەکات وەکو ووتمان لە سییەکاندا هەیە کە β2 ش بلۆک کرا لە سییەکاندا Bronchspasm ڕوودەدات و ڕەنگە ژیانی کەسەکە بکەوێتە مەترسییەوە ، بەڵام Selective ئەم کۆمەڵەیان ئەم کاریگەرییەی نییە چونکە تەنها β1 بلۆک دەکات ، ئەگەرێکی زۆر کەمی هەیە کە تووشی ئەوەی بکات ئەویش مەگەر لە دۆزی زۆردا.

ئەوانەی شەکرەیان هەیە بەتایەتی ئەوانەی کە لەسەر insulin ڕەنگە بەهۆی بەکارهێنانی insulin کەوە تووشی هایپۆگلایسیمابن ، یەکێک لە نیشانەکانی هایپۆگلایسیماش خێرا لێدانی دڵە بەڵام ئەگەر کەسێک ئەم دەرمانانەی بەکارهێنا بێت ئەوا ڕەنگە کەسەکە هەست بەوە نەکات کە تووشی هایپۆگیلایسیما بووە و کێشەی گەورەی بۆ دروست بێت بۆیە دەبێت بە ئاگاییەوە بۆ ئەو کەسانە بەکاربهێنێت کە شەکرەیان هەیە و بەتایبەتی تر ئەوانەی کە لەسەر insulin . هەروەها β blockers خۆشیان ئەگەری هەیە ببنە هۆی هاپیۆگلایسیمیا چونکە ڕێگری لە جگەر دەکەن گلوکۆز بەرهەم بێنێت ، بۆیە باشتر وایە ئەوانەی insulinبەکاردێنن ئەم گروپە بەکارنەهێنن ، ئەوانەشی کە دەرمانی چارەسەری شەکرەیان هەیە دەرمانەکانی ئەم گروپە بەکارنەهێنن یان پێکەوە نەیانخوات ، بەگشتی کۆمەڵە Selective β1 گونجاوترە لە non selective بۆ ئەوانەی کە شەکرەیان هەیە.

کەمبوونەوەی لێدانی دڵ ، ئەگەر نەخۆشێک یەکێک لەم دەرمانانەی بەکارهێنا و لێدانی دڵ بە بەردەوامی یان زۆر کات لە خوار 50 بوو ئەوا ڕەنگە دکتۆر بڕیاری ڕاگرتنی دەرمانەکە بدات ،. AV Block

دابەزانی پەستانی خوێن.

Congestive Heart Failure (CHF )

ئەگەر نیشانەکانی پەککەوتنی دڵ ( کۆکە و تەنگە نەفەسی و ئاوسان و بێهێزی ) تێدا دەرکەوت دەبێت خێرا دکتۆر ئاگاداربکاتەوە.

بێهێزی

ساردی دەست و قاچەکان

ووشکبونی دەم و پێست و چاو

تێکچوونی گەدە

سکچوون یان قەبزی

* نابێت ڕاستەوخۆ واز لە بەکارهێنانی دەرمانەکانی ئەم گروپە بهێنرێت چونکە ڕەنگە ببێتە هۆی خێرا لێدانی دڵ و بەرزبوونەوەی پەستانی خوێن ، بۆیە باشتر وایە لە ماوەی یەک بۆ دوو هەفتە وردە وردە کەم بکرێتەوە تا تەواو وازی لێدەهێنرێت.

تەنها لە حاڵەکاتێکدا دەتوانرێت ڕاستەوخۆ وازی لێبهێنرێت کە دکتۆرەکە بڕیاربدات و بزانێت بەکارهێنانی زیانی زیاتری پێدەگەیەنێت.

*بەڵام مەرج نییە زیانەلاوەکییەکان لە هەموو کەیسەکاندا دەربکەوێت ڕەنگە هیچ کام لەوانەی تێدا دەرنەکەوێت.

نابێت بۆ کێ بەکاربهێنرێت :-

ئەوانەیBradycardia یان هەیە.

ئەوانەی AV Block یان هەیە بەتایبەتی سێکند دیگری تایپی توو یان سێرد  دیگری نابێت بەکارییهێنن.

---

لەگەڵ چ دەرمانێکدا کارلێک دەکەن :-

- Antacid
- Cimetidine
- Hydralazine
- Adrenaline
- Digoxin
- CCB
- NSAIDs
- Rifampin
- Fluoxetine
- Paroxetine
- Warfarin

بەتایبەتی ئەگەر کەسێک Chronic Heart Failure هەبێت ئەگەری ڕوودانیHemorrhage
هەندێکیان لەگەڵ هەندێک لە Antihistamines کارلێک دەکەن

لای خۆمان زیاتر ئەم دەرمانانە باون :-

- Bisoprolol ( Concor )
- Metoprolol ( Betaloc )
- Nebivolol
- Atenolol
- Propranolol ( Inderal )
- Carvedilol
- Labetalol
- Timolol ( Eye Drop )
- Betaxolol ( Eye Drop )


NEBILET®
Nebivolol 5 mg
28 scored tablets
MENARINI
30 comprimate filmate cu eliberare prelungită
Betaloc® ZOK
50 mg
succinat de metoprolol
AstraZeneca
Bystolic
(nebivolol) tablets
5 mg/tablet
INDERAL®
(Propranolol)
tablets 40mg
Each film coated tablet contains Propranolol Hydrochloride Ph. Eur. 40 mg.
50 Tablets
AstraZeneca
INDERAL®
(Propranolol)
tablets 40mg
ESMOLOL HYDROCHLORIDE INJECTION
100 mg/10 mL
(10 mg/mL)
For Intravenous Use
Rx only
10 mL
Single Dose Vial


Caja con 28 tabletas
Tenormin® 100 mg
atenolol
Tabletas
AstraZeneca
Carvedi-Denk 25
carvedilol 25 mg
30 tablets | comprimés | comprimidos
Made in Germany
Carvedi-Denk 6.25
carvedilol 6.25 mg
30 tablets | comprimés | comprimidos
Made in Germany
Ophthalmics
Xolamol™
(Dorzolamide, Timolol)
STERILE OPHTHALMIC SOLUTION
زولامول
Xolamol™
5ml


NDC 0143-9622-01 Rx only
Labetalol
HCl Injection, USP
100 mg/20 mL
(5 mg/mL)
FOR INTRAVENOUS INJECTION ONLY
NDC 0591-0605-01
Labetalol Hydrochloride Tablets USP
100 mg
Watson
100 Tablets Rx only
NDC 17478-705-10
Betaxolol Ophthalmic Solution, USP
0.5%
Betaxolol Equivalent
(Betaxolol HCl 5.6 mg/mL)
Rx only 5 mL
Akorn
5 ml
Timolol Maleate Eye Drops IP
IOTIM 0.5% w/v
EYE DROPS
WITH LUBIFILM
आयोटिम ०.५%
FDC


Sotalol 160 mg
Sotalol 80 mg
Sotalol 40 mg
Tablets
28 Tablets
BRISTOL


1st generation (non-selective)
2nd generation (cardioselective)
3rd generation (vasodilating)
EYE DROPS
TIMOLOL
PROPANOLOL
28 tablets
SOTALOL 80 mg
PHARMACEUTICALS
28 tablets
10 x 10 tablets
BISOPROLOL FUMARATE 10mg
ATENOLOL 25 mg
METOPROLOL TARTRATE 100mg TABLETS
28 tablets
100mg
CARVEDILOL 6.25mg tablets
6.25mg
60 tablets
NEBIVOLOL 5 mg
LABETALOL HYDROCHLORIDE 100mg
30 tablets


RX
Concor® COR 2,5 mg
Bisoprolol fumarate
Cardioselective beta-blocker
PRESCRIPTION DRUG
30 film-coated tablets
MERCK

## گروپی چوارەم :- Calcium Channel Blockers ( CCBs )

دەرمانەکانی ئەم گروپە ناوەکەیان بەخۆیانەوەیە چەنەڵەکانی کالسیۆم بلۆک دەکەن لە خانەکانی ماسولکەکاندا ، بەتایبەتی لە خانەکانی لووسەماسولکەکانی لوولەکانی خوێن و ماسوکەکانی دڵدا.

بۆ ئەوەی ماسولکەکان گرژبن پێویستیان بەبڕی پێویست لە کالسیۆم هەیە لە ڕووی ناوەوەی خانەکاندا بۆئەوەی ئەو کردەیە ڕووبدات ، وەکو باسمان کردووە دەرمانەکانی ئەم گروپە چەناڵەکانی کالسیۆم بلۆک دەکەن و ڕێگری دەکەن لەوەی بڕێکی زۆر لە کالسیۆم لە ڕێگەی چەناڵەکانەوە بچێتە دیوی ناوەوەی خانەکان بەمەش لە لووسەماسولکەکانی لوولەکانی خوێن کەمتر گرژدبن و فراوان دەبن ( Vasodilation ) ڕوودەدات ، هەروەها ماسولکەکانی دڵیش کەمتر گرژدەبن و لێدانی دڵ کەمتر دەبێتەوە.

- دەرمانەکانی ئەم گروپە دابەشدەبن بۆ دوو صەب گروپی سەرەکی :-

1- Dihydropyridine ( DHP CCBs )

دەرمانەکانی ئەم صەب گروپە زیاتر کار لەسەر لوسەماسولکەکانی لوولەکانی خوێن دەکەن وەک لە دڵ ، زۆر بەکەمی کار لەسەر ماسولکەکانی دڵ دەکەن.

کۆمەڵێک دەرمان سەر بەم صەب گروپەن ، بەوە دەناسرێنەوە کە کۆتاییان بە ( Dipine ) دێت.

بەشێوەیەکی گشتی و لای خۆمان ئەم دوو دەرمانە باون :-

- Amlodipine ( Norvasc ) 2.5mg , 5mg , 10mg

- Nifedipine ( Adalat ) 10mg , 20mg , 30mg ,40mg 60mg , 90mg

ئەم دەرمانانەش هەر سەر بەم صەب گروپەن :-

- Felodipine
- Nimodipine
- Nicardipine
- Lercanidipine

چەند دەرمانێکی ترن کە کۆتاییان بە ( Dipine ) دێت.

---

2- Non Dihydropyridine ( NON - DHP CCBs )

دەرمانەکانی ئەم صەب گروپە زیاتر کار لەسەر ماسولکەکانی دڵ دەکەن وەک لە لوسەماسولکەکانی لوولەکانی خوێن.

بەشێوەیەکی گشتی ئەم دوو دەرمانە باون :-

- Verapamil ( Isoptin ) 40mg , 80mg , 100mg , 120mg , 180mg , 240mg
  بەشێوەی دەرزیش هەیە 2.5 mg / ml

* زیاتر کار لەسەر ماسولکەکانی دڵ دەکات زۆربەکەمی کار لە لوسەماسولکەکانی لوولەکانی خوێن دەکات.

- Diltiazem ( Cardizem ) 30mg , 60mg , 90mg , 120mg , 180mg , 200mg , 240mg , 300mg , 360mg , 420mg

بەشێوەی دەرزیش هەیە 5 mg / ml

* کە ئەمەیان کار لە ماسولکەکانی دڵ و لوسەماسولکەکانی لوولەکانی خوێنیش دەکات.

بەشێوەیەکی گشتی بۆ چارەسەری ئەمانەی خوارەوە بەکاردێن :-

١- بەرزە پەستانی خوێن. ( HTN )

چونکە ڤازۆدایلەشن دەکەن و PVR کەم دەکەنەوە بەمەش پەستانی خوێنی کەسەکە دادەبەزێت ، بەتایبەتی صەب گروپی یەکەم زیاتر ئەم کارە ئەنجام دەدەن.

٢ - زەبحەی دڵ. ( Angina )

کۆرۆنەری ڤاز ۆسپازم ڕوودەدات و دەبێتە هۆی ئەنجاینا بەڵام دەرمانەکانی ئەم گروپە ڕێری دەکەن لە ڕوودانی ڤاسۆسپازم ، دەرمانەکانی صەب گروپی یەکەم بۆ ئەم مەبەستە بەکاردێن.

٣ - نارێکی لێدانی دڵ ( Arrhythmias )

بەدیاری کراوی صەب گروپی ( NON - DHP CCBs ) ئەم کارە ئەنجام دەدەن چونکە کار لە کۆندەکشن سیتمی دڵ ( SA Nod & AV Node ) دەکەن.

باوترین حاڵەت کە بە دەرزی Verapamil ( Isoptin ) چارەسەر دەکرێت( Supraventricular Tachycardia ( SVT

دەبێت لەژێر مۆنیتەرینگا دەرزییەکەی بۆ بکرێت.

هەروەها بۆ حاڵەتی Atrial Fibrillation & Atrial Flutter بەکاردێت ، بژاردەی لەپێشترمان هەیە بۆیە کەمتر بۆ ئەم مەبەستە بەکاردێت.

بۆ ئەم حاڵەتانەی لای خوارەوەش بەکاردێن :-

- Nimodipine بەکاردێت بۆ چارەسەری( Subarachnoid Hemorrheage ( SAH
  چونکە دەتوانێت بە BBB تێپەرێت و لەوێ ڕێگری دەکات لە ڕوودانی ڤاسۆسپاسم.

- Raynaud´s Disease بۆ چارەسەری ئەم حاڵەتەش بەکاردێت ، خوێنبەرەکانی پەلەکان گرژدەبن و بڕێکی کەم خوێن دەچێت بۆ کۆتای پەلەکان بەتایبەتی پەنجەکانی دەست و قاچ کە شین یان زەرد هەڵدەگەڕێن ، دەرمانەکانی ئەم گروپە وەکو باسمانکردووە ڤاسۆدایلەیشن دەکات و ڕێگری دەکات لە ڕوودانی ئەو گرژبوونە.
  بەشێوەی مەڵهەم و کرێم هەیە بۆ چارەسەری مایەسیری و قڵیشانی کۆم بەکاردێت کە لە گروپی دوازدەیەمی سیستمی یەکەمدا ئاماژەمان پێداوە. بۆ نمونە. Diltiazem & Nifedipine

- Tocolytics بۆ دواخشتنی لە دایکبوونی پێش وەختەی منداڵ ( Premature Delivery ) هەندێک دەرمان بەکاردێن ، یەکێک لەو دەرمانانە دەرمانەکانی ئەم کۆمەڵەیەن بە دیاری کراوی Nifedipine لەڕێگەی کەمکردنەوەی گرژبوونی ماسولکەکانی منداڵدان لەدایکبوونی پێش وەختە دوا دەخات.

زیانەلاوەکییەکان :-

- Ankle edema باوترین زیانی لاوەکی دەرمانەکانی صەب گروپی یەکەمە بەهۆی ڤاسۆدایلیتەیشنەوە فلود لیکەیج دەکات و لە پەلەکانی خوارەوەدا کۆدەبێتەوە دەبێتە هۆی ئاوسانی پێییەکان ، ئەگەر تێبینیتان کردبێت ئەو نەخۆشانەی کە لەسەر Amlodipine زۆریان تووشی ئەوە دەبن ، ئەگەر HF نەبێت ئەوا بزانە زیانی لاوەکی ئەملۆدیپینەکەیە ، زۆر جار دکتۆر بۆی دەگۆڕێت بە دەرمانی گروپێکی تر یان لە هەندێک سەرچاوەدا دەڵێ یەکێک لە دەرمانەکانی ACEIs یان A2RBs بۆ زیاد بکرێت بیانخوات بۆئەوەی ئەو زیانە لاوەکییە نەمێنێت بەڵام زۆرجار بەوەشەوە هەر ئاوساوییەکەی قاچی دەمێنێت بۆیە زۆرجار دکتۆر Amlodipine بۆ لادەبات و دەیگۆڕێت بە دەرمانی گروپێکی تر.
- دابەزینی پەستانی خوێن.
- گێژبوون.
- -بێهێزی.

بۆ چ حاڵەتێک نابێت بەکاربهێنرێت :-

- پەککەوتنی دڵ ( HF )
- ئەوانەی لێدانی دڵیان کەمە ( Bradycardia )
- AV BlocK

به تایبەتی صەب گروپی یەکەم و بەتایبەتی تر Verapamil نابێت بۆ ئەم حاڵەتانە بەکاربهێنرێت.

ئەوانەی کە لەسەر Beta Blockers نابێت دەرمانەکانی صەب گروپی دووەم بەکاربێنن بەتایبەتی Verapamil چونکە هەر دووکیان پێکەوە لێدانی دڵ زۆر کەم دەکەنەوە ، ڕەنگەAV Block یش دروست بکەن بۆیە دەبێت زۆر ئاگاداری ئەوە بیت نابێت هەرگیز پێکەوە بەکەربهێنرێن.

